زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی





ابو الأعلى المودودي
حسن البنّا
سيد قطب


## الجهاد في سبيل الله

# جیهاد لە ڕێی خوا

نوزادی


وەرگێڕانی
ئامۆژگار بەرزنجی



تەفسیر
١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین.
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کوت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و بەرەو تەنگەرایی.
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێزتر بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، ئاتوانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانە هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

بادەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سُورَةُ الزُّمَر

# جیهاد لە ڕێی خوا

نوسینی


أبو الأعلى المودودي

حسن البنا

سيد قطب


وەرگێڕانی

ئامۆژگار بەرزنجی




١٤٢٦ك هەولێر ٢٠٠٥ز

ناوی کتێب بە عارەبی: الجهاد فی سبیل الله
ناوی نوسەر: أبو الأعلى المودودي – حسن البنا – سيد قطب
ناوی کتێب بەکوردی: جیهاد لەرێی خوادا
ناوی وەرگێر: ئامۆژگار بەرزنجی
چاپ و بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
خەت: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٦ك – ٢٠٠٥ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٢٢ ساڵی ٢٠٠٥

التفسير
هەولێر- شەقامی دادگا- ژێر ئوتێلی شێرین پالاس
ت ٢٢٢١٦٩٥- - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٣٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠— ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕ

"جیهاد "ووشەیەکە ئیمڕۆ لە جیهاندا زۆر بڵاوە.لـە لایـەن موسـڵمانان جیهاد مانای خەبات و هەوڵدانە بۆ سەرخستنی وشەی خـوا و لـەناوبردنی کوفـر و سـتەم و بەرپەرچدانـەوەی دەسـتدرێژیکردن . لـە لایـەن ئەوانـەی ناحەزی ئیسـلامن مانـای تۆقـاندن و توندڕەوییـە . ئیمـڕۆ دوای نـەمانی جەنگی سارد و روخانی یەکێتی سۆڤیەت و رژێمە کۆمۆنیستەکان ئیسـلام تاکـە بـاوەڕ و خـاوەنی بەرنامەیـە کـەبتوانێ ڕووبـەڕووی دەسـتدرێژی ئیمپریالیزمی ڕۆژ ئاوا بوەستێتەوە. بۆیە دام و دەزگا و ناوەندە سیخوڕی و راگەیاندنییەکان بەردەوامن لە شێواندنی بنچینەکاتی ئیسلام بـە گشـتی و زاراوەی "جیـهاد" بـە تایبـەتی . بەرهـەم و نەخشـەی دام و دەزگاکـانی راگەیاندنی ناوەخۆش کە شوێن کەوتوو و نوێنەری ئەوانن نیشانی زەقی ئەم هێرشەن.

سەدەی بیستەمی زایینی بە خوێناوی ترین سەدەی مێژوو دادەندرێت . کەتێیدا جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی لە ئەوروپا روویدا و زۆر شـوێنی تریشی گرتەوە. لەسەرەتای سەدەی بیستەم دابوو کە زۆر لە وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقا بوونە ژێردەستەی وڵاتە زلەکانی ئەوروپای ڕۆژئاواو بە دەسـتیانەوە دەیان ناڵاند. زۆربەی وڵاتانی ئیسـلامیش بوونـە ژێردەسـتەی بـەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و ئیسپانیا هۆڵەندا. دوای هاتنی مەغولـەکان ئەمـەش یەکەم جار بوو کە وڵاتانی ئیسلامی بەم شـێوەیە پارچـە پارچـە بکرێـن و موسڵمانان دەسەڵات و سەروەری لە دەست بدەن.

مەغۆلەکان دوای شکانیان لە شەڕی "عین جالوت" بوون بە موسڵمان و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە قەفقاسیا و روسیا و بوونە هێزێك

و وەستان دژی خاچ پەرستانی ڕۆژهـەلات و نـەیان هێشـت ڕووەو جیـهانی ئیسلام بێن. بەڵام هاتنی ئیمپریالیزمی خاچ پەرستی ڕۆژئاوا بـۆ جیـهانی ئیسلامی لە بار و دوخێکی تر بوو. ئیمپریالیزمی داگیرکەر ئـەم جارەیـان نەوەستا بە دزین و تالان کردنـی سـامانی ولاتـانی ئیسـلامی بـەڵکو بـە شێوەیەکی لێزانانە هەستا بە پارچـە پارچـە کردنـی جیـهانی ئیسـلامی و پەروەردەکردنی نەوەیەکی نوێ لە ناو موسڵمانان کە تەنیا بە ناو موسـڵمان بێت و بەس . کەچی ئەوەی داگیرکەر پێ یانی بڵێ ئەمان بە گوێ ی بکـەن و ئەلقە لە گوێ یانە شوێنی بکەون .

ئەم داگیرکردن و روتاندنەوەی داگیرکـەرانی خـاچ پەرسـت بـۆ جیـهانی ئیسلامی بووە هۆی سەر هەڵدانی شۆڕشی یەك لـە دوای یـەك ، هـەر لـە هیندستان تا مەراکیش. لە قەفقاسیا تا نایجیریای گرتـەوە. بـیر و بـاوەڕی ئیسـلامی سەرچاوەی ئەم شۆڕشـانە بـوو. نـەمانی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە ناوەڕاستی نیـوەی یەکـەمی سـەدەی بیسـتەم بۆشـایی یـە کـی گـەورەی پەیداکردوو و گۆڕانکاری یـەکی سـەخت بـوو. پـاش قوربـانی یـەکی زۆر ولاتانی ئیسلامی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیسـتەم یـەك لـە دوای یـەك سەربەخۆیی خۆیان وەدەست هێنا. پاکیستان دوای جیابوونەوەی لـە هینـد وەکو یەکەم وولاتی ئیسلامی هاتە کایـەوە. لـە سـاڵی ١٩٤٨ ئیسـرائیل دروست کرا. هەرچەندە زۆربـەی زۆری ولاتـانی ئیسـلامی بـە شـێوەیەکی ڕەسمی سەربەخۆیی یان وەرگرت بـەڵام لـە بـاری سیاسـی و ڕۆشـەنبیری و ئابورییەوە هەمیشـە پابـەند و لکێنـدراو بـوون بـە ولاتـەکانی ئـەوروپا و ئەمریکا و روسیا. ئیتر لەو سـاوە ململانـێ لـە نێـوان ئیسـلام و بیرۆکـە ڕەوانەکراو و بە زۆر سەپێنراوەکان دەستی پێ کردو بەردەوام بوو.

له نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ژمارەیەك زانا و بانگخواز و بلیمەت پەیدابوون لە مەیدانی بیر و بانگەوازی وکاری سیاسی و کۆمەڵایـەتی. لـە مانە سێیان لە هەموان زیاتر ناودارتر بوون. حسن البنّا ١٩٤٩، سید قطب ١٩٦٤، أبوالأعلی المودودی ١٩٧٨ . ئەم سێ بلیمەتە لە ناو ئـەو هـەموو رووداوە جۆراوجۆر و گرنگانە ژیان کە گۆڕانکاری مێژوویی تێـدا رویـدا. بـە جوانی لە بارودۆخی موسـڵمانان گەیشـتن و شـی یـان کـردەوە. بـە هـۆی دڵسۆزی و لێهاتوویی یان توانیان لە نەخۆشی و دەردی موسڵمانان بگـەن و رێگای چارەسەری بۆ بدۆزنەوە. بۆیە نوسینەکانیان ڕەنگدانەوە و بەرهەمی ئەو واقیعە بوو کە تێیدا ژیان و کاری تێ کردن و کاریان تێ کردبوو. ئیمام حەسـەن بـەننا و مـەولانا ئەبولئـەعلای مـەودودی دامەزرێنـەری دوو بزوتنـەوەی مـەزنی ئیسـلامی بـوون " الاخـوان المسـلمون" و "الجماعـة الاسلامیة" یەکەمیان لە میسر و دووەمیان لە نیمچە کیشوەری هیندستان . ئەم دوو بزوتنەوەیە لە دواییـدا لـە زۆر وولاتـانی جیـهان بڵاوبوونـەوە و بوونە هـەوێنی ئـەم رابـوون و بێدارییـە ئیسـلامییە کـەئیمڕۆ سـەرتاپای جیهانی گرتوتەوە. سە ید قوتـب زانـا و بلیمـەتی بـێ وێنـە ئـەمیش بـە داڕێژەری بیری رەسەنی بووژانەوەی ئیسلامی دادەنرێت . بەننا و مەودودی و سەید قوتب دەیان کتێبی بە نرخیان لەدوای خۆیان بـە جـێ هێشـت کـە کتێبخانەی ئیسلامی هاوچەرخ پێ ی دەڕازێتەوە.

"جیـهاد " لەو بابەتـە گرنگانـە بـوو کـە ئـەم کەڵـە پیاوانـە تـێ ی گەیشـتبوون و دەیـان ویسـت گـەلانی موسـڵمان تـێ ی بگـەن و پـێ ی بێداربینەوە و ببێتە هاندەرێك بۆیان بە پاراستنی دین و بـاوەڕ و بوونیـان. هەروەها ببێتە رێگایەك بۆ دامەزراندنی ژیانێکی سەربەرز و بەختەوەر کە موسڵمانان تێیدا سەربەخۆ و پێشکەوتوو بن و بتوانن پەیامی پیرۆزی خـوا

که ئیسلامه به گشت جیهان بگەیەنن و حوکمی دادپەروەری ئیسلامی لـــه سەر رووی زەمین بچەسپێنن.

جـا ئــەم ســێ نامیلکەیــه بریتییــه لــه دەقــه پیرۆزەکـانی قورئـــان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ، هــەروەها بریتییــه لــه تێ گەیشتن و بەکارهێنانی زاراوەی جیهاد بــه درێژایــی مێــژوو. ئــەم ســێ نوسەرەش هەستاون و مەسەلەی جیهاد و چۆتیەتی بــەکارهێناتی لــەکۆن و نوێ وه باسکردووه و پــەردەیان لــه ســەر زۆرشــت دامالّیــه کــه ویســتراوه ووشــەی جیــهاد بشــێوێنێ و رووه ڕاســتییەکەی وون بکــات . مـــەودودی دەربارەی کتێبی جیهاد که خۆی نووسیویەتی دەڵێ:( کتێبی " جیــهاد لــه ڕێ ی خوادا " کەخۆم نووسیومه لـــه هــەموو کــەس زیــاتر کــاری لــەخۆم کردووه هەرکاتێ که دەم خوێندەوه زیاتر کاری تێ دەکردم و باوەڕم بەهێزتر دەبوو ). عمر التلمسانی رابەری گشتی بزوتنەوەی برایانی موسڵمان لــه میسر دوای وەفاتی مەودودی له ساڵی ١٩٧٨ له گۆڤــاری " الدعــوة" بــه ناو نیشانێکی گەوره نووسی:" المودودی مجاهد فقده العالم الاسلامی" واته: (مەودودی موجاهیدێك بوو جیهانی ئیسلامی لیّ ی بزر بوو). نامیلکـــەی دووەم به ناوی " رسالة الجهاد"ه واته "پەیامی جیــهاد" کــه یەکێکــه لــه نامیلکەکانی " مجموعة الرســائل" ی ئیمــام حەســەن بــەننا . نامیلکــەی سێیەم به ناوی "جیهاد لەڕێ ی خوا" بەشێکه لەکتێبی "معالم فی الطريق " ی سەید قوتب.

مێژوی وەرگێڕانی ئەم سێ نامیلکەیه دەگەڕێتەوه بۆ سەرەتای ســاڵانی هەشتاکان . لەو کاتەدا ئەم نامیلکەیه وەك کتێبێك کۆکرابۆوه و له لایــەن "یەکێتی گشتی قوتابیانی میسر" بڵاو کرابۆوه. ئیمەش بــه باشمــان زانــی وەکو خۆی وەری بگێڕین و لەیەك کتێب بڵاوی بکەینەوه. هۆی وەرگــێڕانی

دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بار و دۆخەی لەو کاتەدا کاری ئیسلامی پێدا تێدەپەڕی . لە سەرەتای هەشتاکان شەڕی عێراق و ئێران تـا دەهـات زیـاتر درێـژەی پێبدا. جیهادی ئیسلامیش لە ئەفغانستان تازە لە گەرمەیدابوو. لە سـاڵی ١٩٧٨ کۆمەڵەی " برایانی موسڵمان " کە ئەو کاتـە پـەنجا سـاڵ بەسـەر دامەزراندنی تێپەڕیبوو لەزۆر وڵاتان لەوانەش عێراق و کوردستانیش تەنـها چوارچێوەیەك بوو بۆ کاری ئیسلامی . لاوانی موسڵمانی کوردستانیش کـە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناو ئەم چوارچێوە کاری بانگەوازی و پەروەردەیی یـان دەکرد بە هیوای شێوازێکی نوێ بوون بۆ کاری ئیسلامی کە زیاتر واقیعـی کوردستان بگرێتە بەرچاوی خۆی. لەو کاتەدا لـە کوردسـتان شۆڕشـێکی نەتەوایەتی چەکداری لە گەرمەی خەبات دابوو دژی حکومەتی بەعس. لـە بەر ئەوەی ڕژێمی بەعسی لە سەر بناغەی دەمارگیری نەتەوەیی و عیلمانی و شۆڤینی لە شێوەی ڕژێمی کەمالیستی تورکیا بوو بۆیـە لـە کوردسـتان زەمینەیەکی بەرفراوان دژی بەعس دروست ببـوو. ئەگـەر هـاتوو پـارت و کۆمەڵە نەتەوەیی "ناسیۆنالیست"ەکـانی کوردسـتان لـە سـەر بنچینـەی نەتەوایەتی دژ بە بەعس خەباتیان دەکرد . ئیسلامییەکانی کوردسـتانیش لەبەر ئەوەی بەعس ڕژێمێکی ڕەگەزپەرست و دژ بە کوردە و هـەروەها لـە بەر ئەوەی حزبێکی عیلمانیـە و دژ بـە ئیسـلام و موسـڵمانانە خـەباتیان دەکرد دژی. بۆیە جەماوەری خەڵکی کوردستان بە گشـت پـارت و لایەنـە سیاسـییەکانی بـەرەنگاری حکومـەتیان دەکـرد. ئەمـەش بـوو وای کـرد لەسـەرەتای هەشـتاکان چـەند جـار ڕاپـەرین لـە شـار و شـارۆچکەکانی کوردستان دژی جەنگ و دژی بەشداری کردن تێیـدا ڕوویـدا . ئـەو گیانـە شۆڕشگێڕییە وای کرد زۆر لە زانایانی ئیسلام و لاوانی موسڵمان لەو قالبە "اخوان"ی یە کۆنە دەربچن و بگەڕێن بەدوای چوارچێوەیەکی نوێ بۆ کاری

ئیسلامی. ئەو رووداو و گۆڕانکارییانەی لەجیهانی ئیسلام و ولاتانی دەوروبەر ڕوویدەدا بێ گومان کاری دەکردە سەر گۆڕەپانی کوردستان.

وەرگێڕانی ئەم نامیلکانە هەولێك بوو بۆ ئاراستەکردن و گرنگی دان بە خەبات دژی زوڵم و زۆرداری حکومەتی بەعس و سیاسەتە دژ بە ئیسلام و دژ بە ئینسانییەکەی لە کیمیاباران و جینۆساید دژ بە گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کورد و بزاڤە ئیسلامییەکان بە تایبەتی. بابەتەکانی ئەم سێ نامیلکەیە باسی لێوە دەکات هەوێن بوون بۆ ئەو جم وجوڵە ئیسلامیەی کە لە ناوەڕاستی هەشتاکان لە کوردستاندا هاتە کایەوە. بۆ زانین و زیاتر ناسینی بزوتنەوە ئیسلامییەکانی هاوچەرخ خوێندنەوەی ئەم سێ نامیلکەیە گرنگە. هەربۆیەش بە پەسندمان زانی بڵاوی بکەینەوە تاکو هەموو لایەك سوودی لێ ببینن و لە کتێبخانەی کوردی کلاوڕۆژنەیەکی گرنگ پڕ بکاتەوە. لەدواییدا زۆرسوپاسی هەموو ئەو برایانە دەکەم کە یارمەتییان دام لە کاتی وەرگێڕانی ئەم نامیلکانە بە پێداچونەوە و رەخنە و راستکردنەوەی کەم وکوڕی زمانەوانی، هەروەها بۆ ئەوانەی بەدەست دەیان نوسییەوە لەڕۆژانێکی سەخت و دژوار و بۆ ئەوانەش کە لەم دواییە خستیان سەر کۆمپیوتەر و هەولدەدەن بە چاپ بگات . خوای گەورە پاداشی چاکەی هەمووان بداتەوە و وا بکات کارەکەمان بۆ رەزامەندی ئەو بێت و بەس.

**ئامۆژگار بەرزنجی**

# جیهاد له ڕێ ی خوادا

لای فەڕەنگەکان واباو بووە، کەهەرکاتێك بیانویستایە وشەی (جیـــهاد) وەرگێڕنە سەرزوبانی خۆیـــان ئـەوا بـە "جـەنگی پـیرۆز"(Holy war) لێکیان دەدایەوە، بەڵام بەجۆرێکی زۆرناشیرین و لێزانانە لێکیان دەدایـــەوە و بەرگێکی رازاوە لەماناو مەبەستی لێـلّ و هەڵبەسـتراویان لەبـەردەکرد، تاوای لیّ هات وشەی(جیهاد) بریتی بێت لەئاکاری دڕندانە و چاوبرسێتی و خوێن رشتن، هەروەها بەهۆی زۆر زانـــی و سـیحربازییان و شـێواندنیان بـۆ رووەجـوان و ئاشـکراکانی راسـتی، هـەرکاتیّ خـەڵك وشـــەی جیـــهادیان دەبیست، شـێوەی چـەند رەوەیـەك (مواکـب) لەخـەڵکی برسـی و رەش و رووتیان دەهاتە پێـــش چـاو کەشمشـێری رووتیـان بەرزکردۆتـەوە و ئـاگری تووڕەیی و کەللەڕەقی لەنێو چاوانیاندا دەباریّ و نیشـانەی تـالآن و دەسـت درێژی لەروویاندا دیارە. نرکەی دەنگیان لەگەلّ (اللّه اكبر) دنیـای پڕکـردوە و لە دوورەوە دەبیسترێت، هەرهەندە تووشی کافرێك بوون ئیتر توند قوڕگی دەگرن،جا یا ئەوەتە دەلّیّ (لاإله إلا الله) و رزگاری دەبیّ، یـالەملی دەدریّ و خوێن لەملی فیچقە دەکات. تەڵەکەبازان ئەم وێنەیان بەو پەری لێزانیەوە کێشابوو، وەکو هونەرمەندێکی داهێنەر دەستی هونەرمەندێتی خۆیان تێدا دەرخستبوو.. جا بۆ نموونە یـەکێك لەتەڵەکـەبازی و زۆرزانـی ئـەوان لـەم بارەیەوە ئەوە بوو کەئەوان ئەم وێنەیان بەبۆیەیەکی سـووری گـەش رەنـگ کردبوو و لەژێرەوە نووسیبوویان:(ئەم وێنەیـە ئاوێنەیـە بـۆ رابـردووی ئـەم

نەتەوەیە لە تێنوویێتیان بۆخوێنرشتن وچاوبرسێتی بۆ فەوتاندنی خەڵکی بێ تاوان).

سەیر ئەوەیە ئەوانەی ئەم وێنەیان بۆ (جیهاد) دروست کردبوو و لە ناو خەڵکدا دەورێکی باڵایان هەبوو لە پیشاندانی، هەر ئەوانە بوون چەند چەرخێك لەمەوپێش لە ناوخۆیاندا خوێنی یەکتریان فڕدەکرد وسواری سەری یەك دەبوون لەپێناوی تێر کردنی ئارەزووە چەپەڵەکانی خۆیان و کپ کردن و دامرکاندنەوەی ئاگری تەماعکاریەکانیان. ئا ئەمەبوو ئەو جەنگە نەفرەت لیٚکراوە ناپیرۆزانەی (Unholy war) کە هەڵیان گیرساندە سەر نەتەوە بێ دەسەڵاتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ، کە کاتێ بەناو ئەم نەتەوانە دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی بازاڕ بۆ کەلوپەلەکانیان و زەوی و زار بۆ ژێردەستەکانیان "مستعمرات" ، بۆئەوەی خۆیان بەتەنیا دەست بەسەر چاوگەی سامانی ئەو شوێنانە دابگرن لەجیاتی خاوەنە ڕاستەقینەکانی ، بێ وچان هەوڵیاندەدا بۆ دۆزینەوەی کانزا و مەعدەنەکان و هەر شتێك لەو بەروبوومانەی کە زەوی فراوانی خوا بەدی هێنابێت، تاکو ببێتە خۆراك بۆ کارگەکانیان، ئابەم شێوەیە دەبینین بەدوای ئەو هەموو شتانە دەگەڕێن و لەکاتێکدا هەناویشیان پڕە لە چاوبرسێتی و چاوچنۆکی و تێرنەبوون لەماڵ و پایەبەرزی، بەردەستیشیان پڕە لە تانکی پڕچەك و فڕۆکەکانیشیان بەری ئاسمانی گرتووە و سەدان هەزار سەربازی مەشق کراویشیان لە دوایە، قوڕبەسەری هەر وڵاتێك کە بکەوێتە سەر ڕێیان، ئیتر رزق و ڕۆزی دەبڕن و ژیانی خۆش و کامەرانی لیٚ دەخەنە تەنگ و چەڵەمە و مەترسییەوە. دەیانەوێ بەم شێوەیە سووتەمەنی بۆ ئاگری تەماعکارییە چەپەڵەکانیان ئامادەبکەن، کە بە درێژایی ڕۆژگار زیاتر کلپە دەسێنێ. کەواتە جەنگەکانیان لە ڕێ ی خوادا نەبوو و (نییە)، بەڵکو لەپێناوی هەواو

ئارەزووە چەپەڵ و بۆگەنەکانیان بوو. ئەوەی جێ ی سەرسوڕمانە ئەو شاڵاو و هێرشە ناپاك و دڕندانە یان بوو بۆسەر میللەتە بێ زیان و هێمنەکان، کەئەو میللەتە بەستەزمانانە هیچ گوناهیان نەبوو ، تەنیا ئەوە نەبێت کەخوای گەورە خاکێکی پڕ کانزای پێدابوون ، یاخود ئەم میللەتانە خوا زەوییەکی بەپیت و بەرەکەتی پێ بەخشیبوون کەجۆرەها دانەوێڵە و بەروبوومی دەهێنایە بەرهەم ، ئەگەر ئەمانەشیان نەبووبێت ، ئەوەندەی بەسە کەڕەنگە ببێتە بازارێکی گەرم بۆ ئەوەی کەل و پەلەکانیانی تێدا بفرۆشن ، یاخود ببێتە ژێر دەستەیەك بۆ خزم و کەسەکانی ئەم میللەتە داگیرکەر و چەوسێنەرە، کە لەزەوی خوادا جێ یان نابێتەوە، هەر دەڵێ ی زەوی دەری پەڕاندوون!، لەمە ناخۆش تر و تاڵ تر ئەوەیە ئەو داگیر کەرانە زۆر جار هێرش بۆسەر وڵاتێکی تری هێمن و بێ زیان دەبەن، تەنیا لەبەر ئەوەی دەکەوێتە سەرە ڕێ ی وڵاتێکی تر کە لەمەوپێش داگیریان کردووە!!
یان ئێستا بەتەمان داگیری بکەن و جڵەوی فەرمانڕەواییەکەی بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە ، ئەمە حاڵی ئەوانەیە کە بەغەزا کردن و شەڕکردن تاوانبارمان دەکەن، جا بێ گومان ئەو جەنگ و فتوحاتانەی کە ئێمە کردوومانە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، کەچی کردەوە ناشیرین و سەرشۆڕکەرەکانی ئەوان هەرماوە وتائێستاش بەبەردەوامی لە پێش چاوی شارستانێتی ئەمڕۆی جیهانیدا دەیکەن . ئایا چ وڵاتێك ماوە لەسەر رووی زەمین لەدەست درێژیی ئەمانە رزگاری بووبێ و زەوی و زارەکەی بەخوێنی گەشی لاوەکانی سوور نەبوو بێت؟! ئایا کام کیشوەر لە کیشوەرە مەزنەکانی ئەفریقا و ئاسیا ماوە دەردەسەری جەنگە ناپاك و نەفرەت لێ کراوەکانی ئەوانی نەچێژ تبێت؟ بەڵام ئەم تەڵەکەبازانە وێنەی ئێمەیان بەشێوەیەکی ناشیرین و نارێك پیشانداوە و دووبارە هاتوون بەشێوەیەکی

زۆر ترسناکتر لەجاران پیشانیان داوەتەوە، بۆ ئەوەی خـەڵك وێنـە نـاڕێك و نابووتەکەی ئەوانی لەبیر بچێتەوە و کەس باسیشیان نەکات، لەجیاتی ئەوە ئەو وێنە ناشیرینەی ـ کەئـەوان ـ بـۆ مێـژوو و کەلـەپوور و شـانازی پـێ کراوەکانی(المفاخر) نەوەی رابردوومانیان دروست کردبوو، بەرچاو بێت.

ئای لەفێڵ و تەڵەکەبازی ئەوان.. چەند گەورەیە!! چەند لێ هـاتوون لـە درۆکردن و لێڵ کردن و شێواندن.. کەچی گەمژەیی و ساویلکەیی ئێمە هەر لەباس کردن نایەت!.. گەمژەیی و ساویلکەیی لەوە زیاترە کەوا بـەو وێنـە ناشیرینە هەڵبخەڵەتێین کە ئەوان شانازی نەوەکانی رابـردووی ئێمـەیان پـێ پیشاندابوو، خەریك بێت بڕوای پێبکەین و بڵێین بێگومـان ئەمـە راسـتە و لەگەڵ راستیدا جووتە و یەك دەگرێتەوە، هەرگیز بەبیرماندا نەهات سەرنجی ئەو دەستە ناپاکانە بدەین ، کە لەتاریکیدا دەوری خۆیان بینیوە لە دروست کردنی ئەو وێنە بەدرۆ هەڵبەسـتراوە و بـەدوای ئـەو پێنووسـە شـاراوانەدا بگەڕێین کە دەوری هونەرکاری خۆیان بینیـوە لەڕازاندنـەوە و لێـڵ کـردن و شێواندنی ئەم وێنەیە، بەڕاددەیەك بەو وێنە بەدرۆ هەڵبەستراوە و شـێواوەی ئەوان هەڵخەڵەتاین، تا وامان لێهات شەرم دامان گرێ و پەشیمانببینەوە و داوای لێ بوردنیان لێبکەین ، بەوەندەش رانەوەستاوین بەڵکو قسـەی خـوا دەگۆڕین و دەست کاری لە واتاکانیدا دەکـەین و دەڵێـین: بـەرێزان ئێمـە و شەڕکردنیان هەرگیز نەگوتووە!! بەڵکو ئێمە بانگکەر و مژدەدەرین، بـانگی خەڵك دەکەین بۆ ئایینی خوا ، ئایینی هێمنـی و ئاشـتی و حەسانەوە... بەشێوەی پەند و ئامۆژگاری جوان، قسەی خوا رادەگەیەنین وەکـو رەبـەن و دەروێش و سۆفیەکان.. ئەوەی بەربەرەکانێ و دەمەتەقێمان لەگەڵدا بکات، ئێمە بەقسەی خۆش وەڵامی دەدەینەوە، یا بە لێـدوان و نامیلکـە ووتـاری پێ رادەگەیەنین ، تاکو ئەوەی باوەڕ بە بانگەوازەکەمان دێنی بـا بـەجوانی

تێی بگا و هەموو شتێکی لەلا روون بێت. ئەمەیە راستی بانگەوازەکەمان بێ کەم و زیاد!! بەڵام شمشێر و شەڕ کردن پەنا بەخوا! ئێمە هیچ پەیوەندیمان پێوەی نیە، تەنیا مەگەر بڵێین ئێمە پارێزگاریمان لەخۆمان پێکردبێت لەدەست درێژی کردن، ئەمەش ماوەیەکی زوو بوو و چەند ساڵ و عەیامێکی بەسەردا تێپەڕیوە.

جا ئێمە ئەمڕۆ بێ تاوانی خۆمان لەم مەسەلەیە ئاشکرا دەکەین، بۆیە وا لاپەڕەی جیهادمان (بەرەسمی) سڕییەوە.. ئەو جیهادەی کە شمشێر دەوری خۆی تێدا دەگێڕا، تاکو ئێوە دڵتان خەتەرە نەکات و خەویش بچێتە چاوتان ، جیهادیش لە هەوڵ دان بە پێنووس و زوبان زیاتر نییە..ئێمەش بێجگە لە قسەی نەستەق و وتار نووسین هیچی ترمان بەدەست نییە. بەڵام تۆپ و تانك و رەشاش و هەرشتێکی دیکەی لەم بابەتە، لە کەرەسەی جەنگ و شێوەی بەکار هێنانیان شایستەی ئێوەیە و.. هەر ئێوەن خاوەنە راستەقینەکەی.

ئەمە بوو ئەو فێڵ و تەڵەکە رامیارییانەی کە لەمەوپێش پەردەمان لە رووی هەندێکیاندا لادا. بەڵام ئەگەر بێتو ئێمە بەجوانی و لە روانگەیەکی زانستیانەوە سەرنجی ئەم مەسەلەیە بدەین و بەوردی لەو هۆیانە بکۆڵینەوە کە بوونەتە دەرنەکەوتنی راستی ی(جیهاد لەرێی خوادا) و وون بوونی نهێنیەکەی لە لایەن موسوڵمانەکانەوە بێجگە لەغەیرە موسڵمانەکان!، بۆمان دەردەکەوێت کەسەرچاوەی ئەم هەڵەیە بۆ دوو هۆی گرنگ دەگەڕێتەوە کە ئەوان نەچوونەتە قووڵاییەکەی و لەرووی راستی مەبەستەکە نەگەیشتوون-:

یەکـەم: ئـەوان ئیسـلام بە رێبازگەیەك (Religion) تێدەگەیشتن بەو مانا گشتییەی کە بۆ رێبازگە (النحلة -Religion) بەکاردێت[1].

دووەم: ئەوان موسڵمانەکانیان بە نەتەوەیەك[2] (أمّـة =Nation) دادەنا بەو مانایەی کە بۆ ئەم وشەیە بەکاردێت، لە زۆربەی کاتدا.

لـە راسـتیدا هەڵـەی ئەوان لە تێگەیشتنی ئەم دوومەسەلە سەرەکییە، بـووە هـۆی شـێواندنی رووی راستی ئەم مەسەلەیە، ئەمەش وای لێ کردن لەمەبەستی "جیهادی ئیسلامی" نەگەن ، جا لەراستیدا.. هەروەکو راستی هـەموو دەم شایسـتەی ئەوەیـە پەیـڕەو بکرێـت ، هەڵـەی سـەرەکی لـە تێگەیشـتنی ئەم دوو مەسەلەیە بەشێوەیەکی گشتی باڵێ تاریکی خۆی بە سەر راستێتی "حقیقە" ئایینی ئیسلامدا کێشابوو. ئەم کارەی سەرا و ژێر کرد بوو ، وای لی کرد هەڵوێستی موسڵمانەکان بەرانبەر جیهان و مەسەلە

---

[1]-بەپێویسـتی دەزانم ئـەم واتایـە نەختـێك بـەدرێژی روون بکەمـەوە: لەراسـتیدا Religionلەفەرهـەنگی زوبـانی ئینگلـیزی بـەم مانایانـە هاتووە (دین.. دیانة.. مذهب.. ملة) بڕوانە کتێبی (Dictionary- English- Arabic)لە دار التوجیه اللبـنانی - بـیروت لاپەڕە ٤٥٧، جا لەبەر ئەوە من وشـەی (رێبازگە)م بەکار هێناوە کەمانای وشەی (مذهب) دەگەیەنێت لەزوبانی عەرەبی.

[2]-واتـە نەتـەوە – (أمـة قومـیة)بـەمانا تەسـکەکەی نەتەوە، کەلەبەرامبەرەکەیدا بەئینگلیزی(Nation) ی پێ دەوترێت.. ئەگینا موسـڵمانەکانیش نەتەوەن بەزاراوەی ئیسـلامی.. چـونکە بریـتین لەکۆمەڵـە خەڵکـێك کەلەسـەر بیروبـاوەڕی ئیسـلام کۆبوونەتـەوە و لـەناو کۆمەڵگایـەك رێکخـراون کەلەسـەر ئەم بناغەیە وەستاوە، مل کەچـن بۆ سەرکردایەتیەك کەیاسای خوایی جێ بەجێ دەکات بڕوانە کتێبی (في ظـلال القرآن ج _ ٣ لاپەڕە ١٤٤٥)چاپی ١٩٧٨ ز – ١٣٩٨ك. دار الشروق

نوێکـان و گیروگرفتـه ئاڵــۆزەکانی بەرادەیـەك تەسـك و شـلۆق بـێ، کـە فەرمایشتە نەمرەکانی ئیسلام پێ ی رازی نەبێت.

جا رێبازگــە (Religion) بـە گوێـرەی ئـەو زاراوەیـەی کـە بـاوە! مەبەستیان تەنیا کۆمــەڵێك بیروبـاوەڕ و پەرسـتن و دروشمێکـە، بێگومـان رێبازگەش بەو مانایە لەمەسەلەیەکی شەخسی زیاتر نییە، جا تـۆ ئـازاد و سەربەخۆی هەر بیروباوەڕێك هەڵبژێری، سەربەستی لـەوەی کـە بـە خـوای خۆتت زانیوە بە هەر شـێوەیەك بێـت بیپەرسـتی، جـا ئەگـەر خـۆت پـێ رانەگیرا تاکو گەرم نەبی بۆ ئەم رێبازگەیە و بۆسەرخستنی بیروباوەڕەکەت، لێرەدا دەتوانی رێگا ببڕی و بە زەوی بــەرین و فراوانــی خــوادا بگـەڕێی و ببیتە بانگ کەر بۆ بیروباوەڕەکەت و پارێزگــاری لەقەوارەکـەی بکـەی بـە بەڵــگە و سەلماندنەوە و بکەویتە دەمەتەقێ و گفتوگۆکـردن بـە زوبـانێکی پاراو و نووکە قەڵەمی رەنگین "بەقسە کـردن و نووسـین" لەگـەڵ ئەوانـەی جیاوازن لەگەڵ تۆدا، بەڵام شمشێر و کەرەسەکانی جەنگ وشەڕکردن و تۆیان نەگوتووە!! ئایا بەتەمایت زۆر لەخەڵك بکەی تــاکو ببنـە موسـڵمان؟ جـا ئەگـەر بێــت و ئیســلامیش رێبازگەیــەك (Religion) بێــت وەکــو رێبازگەکانی دیکەی جیهان، بەگوێرەی ئەو زاراوەی کـە لای ئـەوان بـاوە و بەقسەی ئەوان ، ئەگەر هەڵوێستی ئیسلام لەم بارەیەوە وابوایــە، واتـە بـە گوێرەی ئەو قسەو وەسفانەی کە ئەوان دەیکەن، بــێ گومــان ئـەوا بـەهیچ کلۆجێك رێگە بە جیهاد کـردن نـەدەدرا و ئیســلامیش نەلـە دوور و نەلـە نزیکەوە پەیوەندی بەمەوە نەدەبوو، بەڵام ئەم کارە بە پێچەوانـەی ئەوەیـە، وەکو لەم روون کردنەوەیەی کە لەمەولا دێت بۆت دەردەکـەوێت، هــەروەها ووشەی نەتەوە(Nation) بریتییە لە کۆمەڵە کەسـێك کـە لەگـەڵ یـەکدا

گونجاون (Homogeneous group of Men) کۆبوونەتــەوە و یەکیان گرتووە لەناو کۆمەڵەکانی تردا هــەڵ کــەوتوون بــە هــۆی هاوبــەش بوونیان لە چەند ئیش وکارێکی سەرەکیدا.

ئەو کۆمەڵەی دەبێتە " نەتەوە " بەم مانایە، هیچ هۆیەك نییە وای لێ بکات شمشێر بەکار بهێنێت، تەنیا دووشت نەبێت یا ئەوەتا دەســت درێـژی بکەنە سەری و بیانەوێ مافە ڕەواکانی لێ بسێنن، یاخود خۆی شالاَو بباتە سەر کۆمەڵێکی تر و بیەوێ مافە ڕەواکانی بخوات. جالە جاری یەکەمدا بە جوانی بۆی هەیە، کە ئەمەش زۆر جـار پاڵنــەر " دافـع " ێکـی ڕەوشــتی هەیە وای لێ دەکات کە شمشێر بەکار بهێنێت و بەتوندی لەو کەسانە بدات دەست درێژی دەکەنــە ســەری ، ئەگــەر چــی هــەندێك لەوانــەی هێمنــی و ئاشتیان بەزار گرتووە هێشتا بەمەش رازی نین و ڕێگــای ئــەوەش نــادەن ، بەلاَم جۆرەکەی تر واتە دەست درێژی کردنە سەر مافی خەڵکی تر و هێرش بردنە سەر گەلان و نەتەوەکانی تر بەبێ هۆ، هیچ کــەس بەڕاســتی نــازانێ تەنانەت چەند دەسەلاَت دارێکی زەبردار (Dictators) نــەبێت. ئــەگینا هەتا پیاوە گەورەکانی ئەمەریکا و بەریتانیاش ناوێرن ڕێگا بەم شتە بدەن.

## حەقیقەتی جیهاد

ئەگەر بێت و ئیسلام " ڕێبازگە" یەك بێــت وەکــو ڕێبازگــەکانی تــر و موسڵمانەکانیش " نەتەوەیەك " بن وەکو نەتــەوەکانی تــری جیــهان ، بــێ گومان " جیهاد" ی ئیسلامی زۆربەی رووکاری جوانی و تایبەتمەندی خۆی وون دەکات کە کردوویەتیە تاجی سەری پەرستنەکانی. لەراســتیدا ئیســلام ڕێبازگەیــەك نییــە وەکــو ئــەو ڕێبازگانــەی کــە بــاون ، موســڵمانەکانیش

نەتەوەیەك نین لە نەتەوەكانی تری جیهان. بەڵكو ئیسلام بـیرو پـەیڕەوێكی شۆڕشـگێڕانەیە (Revolutionary) دەیـەوێت هـەموو ڕژێمـە كۆمەڵایەتیەكانی ئەم جیهانە بڕوخێنێ و لەڕەگەوە دەریان بـهێنێت و سـەر لـەنوێ دەسـت بكـات بـەبنیات نـانی بـەگوێرەی فكرەكـەی و پـەیڕەوە كردەوەییەكەی، لێرەدا دەزانـی ووشـەی" موسـڵمان " وەسـفێكە بـۆ ئـەو كۆمەڵە شۆڕشگێڕە جیهانییەی(International Revolutionary Party)كە ئیسلام پێكی دەهێنێت و ریزەكانی ڕێك دەخات تـاكو ببێتـە ئامرازێك بۆ هێنانەدی ئەو خەباتە شۆڕشگێڕییەی(Revolutionary Struggle)كە پەیدا دەبێت لە ئاكامی ئـەو بزووتنـەوە بـێ وچانـە بـۆ گەیشتن بەم ئامانجە.

ئیسلام لە بانگەوازەكەی و لە روون كردنەوەی پەیڕەوە كردەوەییەكـەی، خۆی دەپارێزێت لە بەكار هێنانی ئـەو وشـانەی كـە بـاون، وەكـو هـەندێ لەبانگەوازە فیكری و پەیڕەوە شۆڕشگێڕییەكانی تـر. بـەڵكو بـەكارهێنانی چـەپكێك لـەزاراوەی (Terminology) تایبـەت بـەخۆی بـە باشـتر دەزانێت، تاكو هیچ ئاڵۆزییەك روونەدات، لە نێـوان بانگەوازەكـەی و ئـەو فیكرە و تێڕوانینانەی (تصورات) كە پێیەوە بەندن و لەگـەڵ ئـەو فكـرە و بۆچوونانەی تر كەهەن و بڵاون . (جیهاد) لەو وشانەیە كە ئیسـلام لەسـەر ئەوە راهاتووە بـەكاری بـهێنێت لـەجێ بـەجێ كردنـی ئەركەكـەی و روون كردنەوەی بانگەوازەكەی بەدرێژی. بۆیە دەبینی ئیسـلام خـۆی لـە وشـەی "جەنگ " و وشەی تری لەم بابەتـە دەپـارێزێت ، كـەمانای شـەڕ كـردن (War)دەگەیەنێت واتە " القتال " بەزوبانی عەرەبی ، لە جیـاتی ئـەوە بە وشەی " جیهاد " ی گۆڕیەوە، كەمانای" ئەرك كێشان وتـێ كۆشـان " دەگەیەنێت. لە بەرامبەرەكەیدا لەزوبانی ئینگلیزی وشەی(Struggle).

هەیە، بەڵام وشەی " جیـــهاد" زۆر پتـەو تـرو کاریگـەرترە و زیـاتر مانـا ویستراوەکە دەگەیەنێت.

جا ئەو شتەچی بووە پاڵی بەئیسلامەوە ناوە تاکو ئـەم وشـەیە تـەرخان بکات و چاوپۆشی لەو وشە کۆنانەی تر بکات کە بـاو بـوون؟ ئـەوەی مـن دەیبینم و بەراستی دەزانم تەنیا لەبەر یەك هۆیە، ئەویش ئەوەیە کە وشەی "جەنگ" (War) لە کۆن و نوێدا بـەو شـەڕانە دەوترێـت کـە ئاگرەکـەی دادەگیرسێت و بڵێسە دەسێنێت لەنێوان چەند کەسانێك یاچـەند کۆمـەڵێك یا چەند میللەتێکدا لەبەر ئارەزووی شەخسی و مەبەسـتی تایبـەتی. ئـەو ئامانجەی کەئەم جۆرە جەنگانەی لەپێناودا دەکرێـت لەچـەند مەبەسـتێکی شەخسـی یـا کۆمەڵایـەتی تێناپـەڕێت ، بۆیـە بۆنـی هیـچ فکـرە یـاخود سەرخسـتنی هیـچ بنچینـە "مبـدأ" یێکـی لێنایـەت ، لەبــەر ئــەوەی شەڕکردنی رێدراو لەئیسلامدا لەم جۆرە جەنگانە نیــە هــەر بۆیـە ئیسـلام بەیەکجاری وشەی "جـەنگ" ی واز لیّ هێنـا، چونکـە ئیسـلام ناڕوانێتـە بەرژەوەندی نەتەوەیەك بێجگە لە نەتەوەیەکی تر و راپەڕینی گەلێك بێجگە لەگەلێکی تر، لای ئەو گرنگ نیە کەم یا زۆر "زەوی" ببێتە موڵکی فـلان دەوڵەت یا ئەوی تر، ئەوەی گرنگ بێت لای ئەو بـەختیاری و سـەرکەوتنی هـەموو ئـادەمیزادە. چونکـە خـۆی فیکرەیـەکی تایبـەتی و پـەیڕەوێکی کردەوەیی هەڵبژێرراوی خۆی هەیە بۆ بەختیار کردنی کۆمەڵگای ئادەمیزاد و بەرزکردنەوەی بۆ پلە بەرزەکانی سەرکەوتن ، هەر فەرمانڕەواییەك لەسەر فکرەیەکی جیا لەم فیکرەیە و پەیڕەوێکی جیا لەم پـەیڕەوە دامـەزرابێت ، ئەوا ئیسلام بەربەرەکانیّ ی دەکات و هەوڵی رووخاندن و تەفرو تونا کردنی دەدات.

هیچ بایەخ نادات بەو وڵاتـــەی کەئـەم فەرمانڕەواییــە ناڵـەبارەی تێـدا دامـەزراوە، یاخود ئەو نەتەوەیەی کە کاروباری ئەم فەرمانڕەواییـــە بـــەڕێوە دەبات. بەڵکو ئامانجی ئەو بریتیە لەبەرزکردنەوە و بڵاوکردنـــەوەی فکـرە و پەیڕەوەکەی و دامـەزراندنی فەرمانڕەوایان و چەسپاندنی کۆمەڵـەکانیان لـە سەر ئەم فیکرە و پەیڕەوە ، بەبێ تەماشا کردنی ئەوەی ئایا کێ ئـاڵای داد و راستی هەڵ دەگرێت یا کێ ئـاڵای دەسـت درێـژی کـردن و خراپـە کـاری لەدەستدا دەشکێت؟ ئیسلام پێویستی بە هەموو رووی زەوی هەیە و تەنـها بـە پارچەیـەك یـا بەشـێکی دڵنیـا نـابێ، بـەڵکو داواکـاری و داخوازیـی سەرتاپای زەوی دەکات، داواکاریەکەی بۆ ئەوە نیە کە نەتەوەیـەك بەتـەنیا دەست بەسەر سامانەکەدا بگرێت، پاش ئەوەی لەدەست نەتەوەیەك یاچـەند نەتەوەیەکی تـری دەردەهێنێـت. بـەڵکو ئیسـلام داوای ئـەوە دەکـات کـە هەموو ئادەمیـزاد تـــام و چێـژ لـە پـەیڕەوە کردەوەییەکـەی و لـەو بـیرو باوەڕەی کە بەختەوەری ئـادەمیـزادی تێدایە وەرگرن کە خـوای گـەورە بـە هۆی ئەم دوو شتەوە ئیسلامی بەسەر هەموو ئـــایین وشـەریعەتەکانی تـردا بەرز کردۆتەوە و زیاتر رێزی لێ ناوە، جا بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجـە پـیرۆزە ئیسلام دەیەوێت هەرچەند هێز و توانا و ئامرازی شیا و هەیـــە بخاتـە کـار بۆئەوەی شۆڕشێکی گشتی تەواو هەڵگیرسـێنێ ، بۆگەیشـتن بـەم ئامانجـە مەزنەش هەرچی لە توانادا هەیە بەکار بێنێت. جا بەم خەباتە بێ وچانـە و بەکار بردنی ئەوەی هەیە لە هێز و سـەرمایە " المبـالغ" و بـەکار هێنـانی جۆرەها رێگای کە لە توانادا هەیە دەوترێـت " جیـهاد". کەواتـە جیـهاد وشـەیەکی کۆکەرەوەیـە، هـەموو جۆرەکـانی کۆشـــش و ئـــەرك کێشـــان دەگرێتەوە. کـاتێ ئـەوەت زانـی لات سـەیر نـابێ ئەگـەر بڵێـم: گۆڕینـی تێڕوانینی خەڵك و بۆچوون و ئارەزوویان و بەرپاکردنی شۆڕشـێکی ژیـری و

فیکری بەهۆی نووکی خامەوە ، جۆرێکە لە جۆرەکانی "جیهاد" هەروەکو چۆن لەناو بردنی رژێمە کۆنە پەرست و زۆردارەکانی ژیان بەهۆی شمشێر و دامەزراندنی رژێمێکی نوێ لەسەر بناغەی داد و یەکسانی ئەویش جۆرێکە لەجۆرەکانی جیهاد ، هەروەها بەخشینی ماڵ و بەرەنگاربوونی کۆسپ و دژوارییەکانی ژیان، ئەوانەش چەند بەشێك و بەندێکی گرنگن لەکتێبی "جیهاد" ی مەزندا.

## لە پێناوی خوادا

بەڵام جیهادی ئیسلامی وەنەبێ بێ هیوا و ئامانج بێت، بەڵکو لەراستیدا جیهادێکە لەپێناوی خوادا، ئەم مەرجەشی هەرگیز لێ جیا ناکرێتەوە و هەردەم پێیەوە بەندە، " فی سبیل الله " ش لەو وشانەیە کە ئیسلام هەردەم بەکاری دەهێنێت بۆ روونکردنەوەی بیرۆکە و فەرمایشتەکانی کە تازە دەست نیشانم کردن ، وادیارە زۆر کەسیش بەم مانا زمانەوانییە رووکەشە هەڵخەڵەتاون و وادەزانن کە " جیهاد لەرێگای خوادا" سەر پێ شۆڕ کردنی خەڵکە بۆ بیروباوەڕی ئیسلام و زۆر لێ کردنیانە بۆ قبووڵ کردنی ئەم بیروباوەڕە، چونکە سینگ تەسکی و فراوان نەبوونی مەودای بیرکردنەوەیان رێی ئەوەیان نادات لەم ئەندازەیە بەرزترببنەوە و لەئاستێکی بڵند تردا بیربکەنەوە. لەراستیدا " لە رێ ی خوا " لەزاراوەی ئیسلامیدا زۆر فراوانترە لەوەی ئەوان بۆی دەچن و ئامانجێکی بەرزتر و خواستێکی زۆر دووربینتری هەیە لەو مەزەندە و گریمانەی ئەوان دەیکەن. واتە هەر ئیشێك کەبیکەیت بۆ بەرژەوەندی گشتی و بەختیار بوونی کۆمەڵگا ، بەمەرجێ ئەم ئیشەت لەپێناوی رەزامەندی

خوادا بێت و هیچ قازانج و دەست کەوتێکت لەم ژیانـــەی دنیـادا نـەوێت ، بەپێ ی تێڕوانینی ئیسلام ئەمە لە "ڕێ ی خوا" دایە. لە هـــەمان کـاتدا ئەگەر دەتویست بەشێك لەم چاکەیەت بـۆ بگەڕێتـەوە بەشێوەی قـازانجی ئەدەبی ومادەدی لە ژیانی دنیای (فانی)دا ئەوا بـێ گومـان ئەمـە بـەهیچ جۆرێـك لـەپێناوی خـوادا نییـە. ئەگـەر چاکەیـەکت لەگـەڵ نـەدارێك یـا سوالکەرێکدا کــرد تەنـها لـەراهی خـوا و هیـچ شـتێکت لـەپاڵ ئەمـەدا نەدەویست، بێ گومان ئەم کارەت لــەپێناوی خـوا بـۆ دەژمـێردرێت، ئـەم زاراوە ئیســلامییە تایبەتییـە، واتـە ( لـەرێ ی خـوادا ) بـەو کردەوەیـە دەوترێت کە لەرێگای خوادا دەکرێت بەمەرجێك هیچ خڵتە و پیسی هەوا و ئارەزووی تێکەڵ نەبێت. جا مرۆڤ دەبێـت بـڕوای وابێـت کـە هەرئیشـێك دەکات بۆ بەختیاریی براکانی لەپێناوی رەزامـــەندی خوادابێـت، دەبـێ دوا مەبەستی لەژیانی دنیادا و هەرئیشێك کەتێیدا دەیکـات لـەپێناوی خـوای گەورەدا بێت.

جا رێبازدانەر(الشّـــارع)کەخوایـە ، "جیـهاد" ی بـەم مەرجـەوە بـەند نەکردووە مەگەر تەنیا بۆ ئەم مانایە نەبێت ، ئەوەی ئیسلام داوای دەکـات ئەوەیە هەرکاتێك تاکێك یـا کۆمـەڵێك لەموسـوڵمانان ئـەرکی سەرشـانی خۆیان بەجێهێنا و بە هەموو توانایەکی خۆیانەوە بۆ لەناوبردنی ئەم رژێمـە نارەوا و بابردووانە تێکۆشـــان و دامــەزراندنی رژێمێکـی نوێیـان لـە سـەر بنەماکانی ئیسلام بەپێویست زانی، ئەوا پێویســتە لەسـەریان دووربـن لـە هەموو مەبەستێك و پاك بن لە هەموو هەواو ئارەزوویەکی خۆیی و نـابێت دوای هەستان بەم ئەرك و تێ کۆشانە و بەخشینی گیـــان و مـاڵ و دارایـی هیچ مەبەستێکیان هەبێت ، جگـە لەدامــەزراندنی رژێمێکـی دادپـەروەر، کەداد و راستی لەناو خەڵکدا بێنێتە کایەوە و ئەو رژێمە بە هیچ رژێمێکی

تر لەم ژیانە کورت و بڕاوەیەدا نەگۆڕێتەوە. جا ئەو کەسە یان ئەو کۆمەڵــە نابێت لەم خەبات کردنە بێ وچان و جیهادە بەردەوامەیدا بۆ بەرزکردنەوەی قسەی خوا هیچ جۆرە مەبەستێکی هەبێت وەك وەدەست هێنانی پلەو پایە و ناوبانگ و گەورەیی!!، نابێ لەکاتی ئەم هەموو هەوڵ و کۆششە مــەزن و زۆرەدا، خۆی و هۆزەکەی بەرزبکاتــەوە و خــۆی بەتــەنیا جڵــەوی کاروبــار بگرێتە دەست و بچێ جێگــەی تاغووتــە گوناهبارەکــان بگرێتــەوە، پــاش دەرکردنی زەبردارە زۆردارەکان لەتەختی پاشایەتی ، ئەوەتا قورئانی پــیرۆز پڕ بەدەم بانگ دەکات و دەڵێت: ﴿الَّذِينَ آمَنوا يُقاتِلونَ في سَبيلِ اللهِ والَّذِينَ كَفرُوا يُقاتِلونَ في سَبِيلِ الطَّاغوتِ.﴾ (النساء :٧٦) واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ڕێگای خوا شەردەکەن و ئەوانەش باوەڕیان نە هێناوە لە ڕێگــای تاغوتدا شــەردەکەن) ،" طُغْيَــان " یــش هــەروەکو فەرهەنگــەکانی زوبــان لێکی دەدەنەوە مانای لەســـنوور تێپــەڕین دەگەیــەنێت ، واتــە هەرشــتێك لەرادە و سنووری خۆی تێپەڕی لەگوناە کردن ، ئەمە سنووری بــەزاندووە، هەروەکو دەڵێن طغا السَّيْلُ- واتە ئاوەکە بەرز بۆوە تالەســـنووری خــۆی تێپەڕی لەبەر زۆری ، هەروەکو لە قورئانی پیرۆز داهاتووە ﴿ إِنَّــاَ لَمَّــا طَغَــى الماءُ.﴾ (الحاقة:١١) ، واتە: (کاتێ ئاوەکــە لــە سنوری خــۆ ی تێپــەڕی و پەنگی خواردەوە) ، لێرەدا وشەی " الطغيان " هێنراوە لەبەر تێپــــەڕبوونی ئاو لەسنووری خۆی ، هەروەها ئەگەر هاتوو ئادەمیزادیش لەسنووری خۆی تێپەڕی و دەستی بەخراپە کاری کرد لەسەر زەویدا و خەڵکی بەخورتی و نا بەدڵی دەکردە بەندەی خۆی و هەقی دەخواردن و بێ بەشی دەکردن لەپیت و فەڕو بەروبوومی زەوی، ئەمە دەبێتە "جەنگ کــردن لــەرێ ی تــاغووتدا" کەخوا ئێمەی لێ ترساندووە و کردوویەتی بە دروشم و نیشانەی کافرەکــان. بەڵام شەڕ کردن لەرێ ی خوادا ئامانجەکەی تــەنیا ئەوەیــە یاســای خوایــی

دادپەروەر ئالاّکەی هەموو جیهان دابگرێت و واتاکەی لەسەر هەموو دنیا بەرز بێتەوە، بەجۆرێك یەکەم جار جەنگاوەر لەرێ ی خوادا دەبێت خۆی شوێن ئەو یاسا دادپەروەرە بکەوێت، پاشان نەوەکانی ئادەمیزاد بۆ ئەم یاسایە هان بدات و وابکات فەرمانەکانی بهێننەدی ، خواش بۆ ئەوانەی کەئەم ئاینە دەهێننەدی لەژیان و واتاکەی بەرز دەکەنەوە لەسەر زەوی و لەسنووری دەرناچن و لەفەرمانی لانادەن، بەڵێنی ژیانی دوایی و بەختەوەریی هەتا هەتایی پێداون ، هەروەکو خوا دەفەرموێت: ﴿ تِلكَ الدَّارُ الآخِرةُ نَجعَلُها لِلّذِينَ لايُرِيدونَ عُلُوّاً في الأَرْضِ وَلافَسَاداً وَالعاقِبَةُ لِلمُتَّقِينَ. ﴾ (القصص :٨٢). واتە: (ژیانی دوایی " بەهەشت " بۆ ئەوانە دابین دەکەین کە لە دونیادا لووت بەرزی و خراپەکاریان ناوێ و چارەنووس و عاقیبەتیش هەر بۆ لەخوا ترسانە).

هەروەها دەگێڕنەوە ئەعرابییەك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێ ی ووت ((الرَّجُل يُقاتل للمَغْنَمِ والرَّجُل يقاتل للذِّكر والرجل يقاتل ليرى مكانه فمن في سبيل الله؟ قال من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله)) واتە: (پیاو هەیە بۆ دەست کەوت شەڕ دەکات و پیاو هەیە بۆ ناو هەڵدان شەڕدەکات و پیاویش هەیە بۆ ئەوە شەڕ دەکات کە جێگەی خۆی ببینێت ، کامیان لەرێ ی خوادا شەڕدەکەن؟ ئەویش فەرمووی : ئەوەی بۆ سەرخستنی ووشەی خوا شەڕ بکات ئەوەیان لەرێ ی خوادایە) هەروەها أخرج أبوداود والنسائي من حديث أبي (رضي الله عنه) بإسناد جيد قال

جاء رجل فقال: يارسول الله أرأيت رجلاً غزا يلتمس الأجر والذكر مالَهُ؟ قال: لاشيء له. فأعادها ثلاثاً.. كل ذلك يقول لاشيء له. ثم قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ((إن الله لايقبل من الأعمال إلاّ ما كان خالصاً.. وابتغي به وجهه)). واتە: (جارێکیان پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر

(ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر هاتوو پیاوێك شەڕی دەکرد بۆ پاداشتی خوا و بۆ ناوبانگ دەرکردن، ئایا چی بۆ دەنووسرێ؟ فەرمووی هیچی بۆ نا نوسرێ!، پیاوەکە سێ جار دووبارەی کردەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) لەهەر جارێکدا دەیفەرموو: هیچی بۆ نانوسرێ . لە دوایی فەرمووی: خوای گەورە هیچ کردەوەیەك قبوولْ ناکات، تەنیا مەگەر پاك بێت و ویستی ئەوی تێدا بێت ـ لە پێناوی ئەودا کرابێ).

لەمەوە روون بووەوە کە خوای گەورە تەنیا ئەو جیهادە قبولْ دەکا کە بۆ خاتری ئەو کرابێ و ڕەزامەندی ئەوی تێدا بێت.. هیچ چەشنە خواستێکی تایبەتی یا تیرەگەری یا نەتەوایەتی تێکەلْ نەبوو‌بێت ، جا لێرەدا دەزانیت کە ئەم مەرجە ـ لە ڕێ ی خوادا ـ چەند گرنگی هەیە لە زاراوەی ئیسلامیدا، بەم پێیە تێدەگەی کەوا بەندکردنی جیهادی ئیسلامی بەم جۆرە بەندە، چەندە دووربینی و مەبەستی بەرزی تێدایە، بێ گومان تۆ دەبینی هەر گیان لەبەرێك کە خوا دروستی کردبێت لەسەر رووی ئەم زەمینەدا، هەردەم لەهەولْ و کۆششدایە لە پێناوی بەڕێوەبردنی ژیانی خۆی، بەدرێژایی شەو و ڕۆژ تەکان دەدات بۆ گەیشتن و وەدەست هێنانی ئامانجی ، بەلاّم موسلْمانەکان ـ واتە ئەو کۆمەلْە شورشگێرەی کەدان بەئیسلام و باوەڕ بە بنەما شۆڕشگێڕیەکانی ئیسلام دێنن پێش هەمووشتێك باوەڕ بە گرنگترین بنچینە شۆڕشگێریەکانی ئیسلام دێنن، بگرە بنەڕەت و ئەستونەکانی کە ئەویش ئەوەیە: گیانی خۆتان بەخت بکەن و جیهاد بکەن بەمالْ و نەفسی خۆتان ، لە پێناوی دامەزراندنی ووشەی هەق ـ راستی ـ، خۆتان ئامادە بکەن بۆ لەناو بردنی ئەوەی ئارەزووی خراپە و ستەم کاری هەیە، بەوەندەی لەدەستتان دێت لەیارمەتی و بارمتەدا، تاکو تەمبێیان دەکەن و درەختی خراپەکاری لەرەگ و ریشەوە

دەردەهێنن، هەرچەندە رووچووبێتە ناخی زەوی و لەجیهاد کردندا بەردەوام بن ﴿حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَ يَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ .﴾(الأنفال:٣٩) واتە : (تاکوکوفر نەمێنێ و ئایین هەر بۆ خوا بێ). و نابێ ئەو هەوڵ و کۆشش کردنەتان لەپێناوی چاو تێبڕینی شتی پیسدا بێت یان بۆ ئەوەی نەتەوەیەك پەسەندتربێت لەنەتەوەیەکی تر، یان رەگەزێك بەرێزتربێت لەرەگەزێکی تر!، ئێستا بەم جۆرە بەشێك لەمانای جیهادی ئیسلامی و مەبەستە راستەقینەکەیم بۆ روون کردنەوە، کەخەڵك لەم چەرخەدا زۆر کەم بۆی دەچن و هەستی پێ ناکەن، جا دەمەوێت ئەم (بانگەوازە) شۆڕشگێڕییەی ئیسلام هێنانەکایەوە و بەدرێژایی چاخەکانی پێشوو و بەرەنگاریی کۆمەڵی ئادەمیزادی پێکرد بەکورتی باس بکەم ، بەمەرجێك لەگەڵ شوێن وکاتدا بگونجێت، تاکو خوێنەران باش بزانن و بۆیان روون ببێتەوە بۆچی ئەم بانگەوازە لەسروشتیدا ئارەزووی جیهاد کردنی تێدایە و بەپێویستی زانیوە، بۆ ئەوەی زیاتر لە ئامانج ومەبەستی جیهاد بگەن... .

## بانگەوازە شۆڕشگێڕییەکەی ئیسلام

ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە: ﴿يَا أَيُّها النَّاس اُعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ .﴾ (البقرة:٢١) واتە: (ئەی خەڵکینە خوای پەروەردگارتان بپەرستن کەئێوەی خولقاندووە)، کاکڵەی ئەم بانگەوازەیە، بانگەوازە شۆڕشگێڕییەکەی ئیسلام و کرۆك و ماکەکەیەتی، چونکە ئەم بانگەوازە خەڵکی سەر رووی زەمین نادوێنێ بەناوی کرێکاران و جوتیاران، یا سەرمایەداران! ئەوانەی کە ماڵ و داراییان زۆرە، ناویان ناهێنێت بەناوی کۆمەڵەکانیان یاچینەکانیان، بەڵکو بەگشتی لەگەڵ هەموو ئادەمیزادێك

دەدوێ و تەنیا بەو سیفەتەی ناویان دێنی کەهەموویان تاکەکانی نەژادی ئادەمیزادن. جا فەرمانیان پێدەکات کەتەنیا خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدانەکەن و بێجگە لەو هیچ خوایەك یاپەروەردگارێك نەکەن بەخوای خۆیان. هەروەها داوایان لێدەکات لەفەرمانی خوا دەرنەچن و لەخواپەرستیدا سەرپێچی نەکەن. لەزەوی خوادا لووت بەرز نەبن و فیز لێنەدەن، چونکە حوکم و فەرمان هەر بۆ خوایە و هەڵسوڕاندنی زەوی و ئاسمانەکان بەدەستی ئەوە، جا نابێت بۆ هیچ یەکێك لەبەندەکانی هەر کامێکیان بێت ، لەسەر رووی زەویدا خۆی بەرزبکاتەوە و فیز لێبدا و بەزۆری خەڵك مل کەچی خۆی بکات تاکو سەری بۆ دابنەوێنن و سەرشۆربن لەئاستی زەبر و زەنگی ئەو، جا بانگەوازەکەی بۆ ئەوانە هەموویانە، تاکو بێن و ئاینی خۆیان پاك بکەنەوە بۆخوا، بۆ ئەوەی یەکسان بن لەم بەندایەتییە گشتییەدا، هەروەکو لە قورئاندا هاتووە: ﴿تَعَالوْا إِلى كَلِمَةٍ سَواءٍ بَيْنَنا وَبَيْنَكُمْ انْ لاَنَعْبُدَ الاّ اللهَ وِلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلا يَتّخِذَ بَعْضُنا بَعْضاً أرْباباً مِّنْ دُونِ اللهِ.﴾ (آل عمران:٦٤) واتە: (وەرن بۆ وشەیەکی یەکسان لەبەینی ئێمە و ئێوە کە کەس نەپەرستین بێجگە لەخوای گەورە و هاوبەشی بۆ پەیدانەکەین ، کەس لەناو خۆماندا نەکەین بە پەروەردگار بێجگە لەخوای گەورە ).

ئەمەش بانگ کردنە بۆ شۆڕشێکی گشتی جیهانی ، بەبێ ترس و گومان و شاردنەوەی هیچ شتێك. پڕ بەدەم بانگ دەکات: ﴿إِنِ الْحُكْمُ اِلاّ لِلّهِ أمَرَ أنْ ألاّ تَعْبُدُوا إِلاّ اِيّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ....﴾(یوسف:٤٠) واتە: (فەرمانڕەوایی تەنیا بۆ خوایە.. فەرمانی داوە بێجگە لەو کەسی تر نەپەرستن.. ئاینی راست ئەوەیە) . هیچ کەسێك نییە لەنەوەی ئادەمیزادا مافی ئەوەی هەبێت، وەك پاشا و خاوەن دەستەڵات خۆی بەسەر خەڵکدا

بسەپێنێ و دەستیان بەسەردا بگرێت، بەئارەزووی خۆی فەرمانیان پێبدات لەو شتەی کە دەیەوێت و قەدەغەی ئەو شتەیان لێبکات کە نایەوێت، چونکە سەربەخۆیی تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵی ئادەمیزادی بۆ فەرماندان و قەدەغە لێکردن" الأمر والنَّهي " ، بێ ئەوەی ئەم کەسە دەسەڵاتی خۆی لە پەروەردگاری مەزن وەرگرتبێت و رێگەی پێ درابێت، فیز لێدانە لەسەر زەوی و دەرچوونە لەفەرمانی خواو چاوتێبڕینە بۆ پلەی خوایەتی ، ئەوانەی رازیش دەبن بەم تاغووتانە کەببنە پاشا و فەرماندە بەسەریاندا، ئەوانە لەراستیدا دەیانکەنە هاوبەشی خوا، کەئەوەش سەرچاوەی خراپەکاری و تووڵانەوەیە فەسادە- لەسەر زەوی. هەر لێرەدا سەرچاوەی شەڕ و ستەمکاری دەتەقێتەوە و سەرهەڵدەداتەوە. ئەگەر هاتو سەرنجی ئەو هۆیانە بدەی کە وادەکات مرۆڤ لەو سروشتەی کەخوا لەسەری دروست کردووە و لەو پەیڕەوە راستەی کەپێ ی نیشان داوە لابدات ، دەبینی هەمووی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە کەئەوان " خەڵك " خوا لەبیردەکەن، لەبەر ئەوە هەقیقەت و راستی خۆیان لەبیر دەبرێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی چەند کەسێك یاخود چەند بنەماڵەیەك یان چەند چینێك لە کۆمەڵ " جا ئەمە بەپەنهانی بکەن یا بەئاشکرا " دەست بگرنە جڵەوی حوکم و کارگێڕان ، ئەم دەست بەسەر داگرتنەش وایان لێ دەکات لەسنووری سروشتی ئادەمیزادیی تێ پەڕن و دەروونیان بۆیان دەڕازێنێتەوە کەخەڵك بکەنە بەندەی خۆیان و بەزۆری سەریان پێ شۆڕبکەن بۆ دان نان بە گەورەیی ئەوان، جا ئەمە چ بەئاشکرا بکەن یا لەدڵی خۆیاندا بیشارنەوە. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە لەئەنجامی نەزانی و بێ ئاگایی مرۆڤ لەبارەی گەورەیی خوایەتی و.. زەبرو زەنگی و.. نەزانینی دەربارەی نرخی ئەو پیاوەتی و ئازایەتیەی کە لە سروشتی ئادەمیزادا هەیە، ئەنجامی

ئەوانە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆر لەخەڵك رازی بن بــەزەبر و زەنگــی ستەمکارە زۆردارەکان و رازی بن بەسەر دانەواندن بۆ دەســتەڵاتی ئــەوان و مل کەچ بن بەوەی کەئەوان مافی فەرمان پێدان و قەدەغەکردنیان هەیــە و هەمیشــە بــۆ فەرمانــەکانی ئــەوان سەرشــۆڕبن، ئەمەیــە بنــج و بنــاوانی خراپەکاری و سەرچاوەی لەرێ لادان و دەست درێژی کــردن و چەوســاندنەوە لەســەر زەوی ، لەبــەر ئــەوە ئیســلام ئــەم خراپــەکاری یــە لــە بناغـــەوە دەردەهێنێ و دەیقرتێنێ، ئەوەتە دەبینـــی چــۆن خــوای گــەورە نــارەزایی و تورەیی خۆی لەقورئانی پیرۆزی پڕ حیکمەت و چەسپاودا دەردەبڕێ:

﴿وَلا تُطيعُواْ أمْرَ الْمُسْرِفينَ الَّذيــنَ يُفْسِــدُونَ في الأرْضِ وَ لا يُصْلِحُــونَ .﴾ (الشعراء:١٥١-١٥٢). واتە: ( گوێ ڕایــەڵی کافرەکــان مەکــە، ئەوانــەی خراپە لەسەر رووی زەوی بڵاو دەکەنەوە و چاکە ناکەن) .

﴿وَلا تُطِعْ مَنْ أغْفَلْنا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنــا وَاتَّبَــعَ هَــواهُ وَكــانَ أمْــرُهُ فَرَطــاً.﴾ (الكهف:٢٨). واتە:( گوێ رایەڵی ئەو کەسە مەکە کەدڵمان غافڵ کــردووە لەبیرکردنەوەی ئێمە، خۆشی دوای ئارەزووی خۆی کەوتووە).

﴿ألا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ألَّذيــنَ يَصُــدُّونَ عَــنْ سَــبِيلِ اللَّــهِ وَيَبْغُونَــها عِوَجاً.﴾ (هود:١٨-١٩). واتە: (لەعنەتی خوا لەو زاڵمانە بێت کــەرێگای خوا لەخەڵك دەگرن و دەیانەوێت لەرێگای راست لای دەن).

لێیان دەپرسێت:

﴿أ أرْبابُ مُتَفَرِّقَونَ خَيْرٌ أمِ اللَّهُ الْواحِدُ القَهّارُ .﴾ (یوسف:٤٠ ).

واتە: (ئایا پەروەردگاری جیاجیا چاکترن، یاخود خوای تاك و دەسەڵات بەزێن) .

ئەگەر ئێوە بەبەندایەتی بۆ خوایەکی تاك و تەنیا رازی نەبن، ئـــەوا بــێ گومــان مــل کــەچی ئــەو تاغووتانــە دەبــن کــەوا لەســەر زەویــدا خۆیــان

بەرزکردۆتەوە ، لەناو گۆماوی زۆرداری و ستەمکاریدا نقووم بوون ، خۆیان کردووە بەخوا و پەروەردگار لەجیاتی خوا، ئێوەش هەرگیز لەدەست بەندایەتی ئەوان رزگار نابن، چونکە جڵەوی کاروباری ئێوەیان بەدەستەو بەکەیف و ئارەزووی خۆیان خراپەکاری و فەساد بڵاودەکەنەوە ئەمەش لەسروشتی ئەوانە کەلەسەری راهاتوون! هەروەك نیگای ئاسمانی ی پەروەردگار دەری دەبڕێ و دەفەرمووێ:

﴿إِنَّ الْمُلُوكَ إِذا دَخَلُواْ قَرْيَةً أَفْسَدُوها وَجَعَلُوا أعِزَّةَ أهْلِها أذِلَّةً وَكَذلِكَ يَفْعَلونَ.﴾ (النحل:٤٣) .

واتە: (بەراستی ئەم پاشایانە کاتێك دەچنە گوندێك (شارێك) خراپە بڵاو دەکەنەوە و پیاو ماقوڵان زەلیل دەکەن و ئەمە پیشەی ئەوانە).

﴿وَإِذَا تَوَلّى سَعَى فِي الأرْضِ لِيُفْسِدَ فِيها وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللهُ لايُحِبُّ الْفَسادَ.﴾ (البقرة: ٤٣).

واتە: (کاتێ دەسەڵاتی پەیدا کرد دەست دەکا بەخراپە لەسەر رووی زەوی ، مرۆڤ و زەوی و زار دەفەوتێنێ، خواش حەز لە خراپەکاری ناکات).

جا لێرەدا پێویستە ئەوەتان لەبیر نەچێ کەبانگەوازەکەی ئیسلام بۆ یەکتاپەرستی - توحید- و پەرستنی خوایەکی تاك وتەنیا، بریتی نەبوو لەکێشەیەکی کەلامی و بیروباوەڕێکی لاهووتی و بەس، وەکو رێبازگەکانی تر، بەڵکو لەراستیدا خۆی بانگەوازێك بوو بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی (Social Revolution) هەر لەیەکەم جارەوە ویستی رەگ و ریشەی ئەوانە دەربهێنێت کەپایە و پلەی بەرزی خوایەتییان گرتۆتە دەست و خەڵکیان بەفێڵ و تەڵەکەبازی کردۆتە بەندەی خۆیان، کەهەندێك بەهۆی فاڵ و نوشتە و جادوو گەرییەوە خۆیان خەریك کردووە.. هەندێکی

تریش حوکم و فەرمانڕەواییان بەتەنیا بۆ خۆیان ڕەخساندووە و دەستیان ناوەتە ملی خەڵك و بەسەریاندا زاڵ بوون ، هەندێکی تریشیان دەسەڵاتی خۆیان سەپاندووە بەسەر سەرچاوەی سامان و بەروبوومی زەوی بەتەنیا بۆ خۆیان.. خەڵکی تریشیان تووشی هەژاری و سواڵ کەری کردووە لەبەردەمی دەرگاکانیان بەجۆرێك کە نان و زگیشیان دەست ناکەوێت. جا بانگەوازی ئیسلام دەیەوێت لەبنەڕەتەوە ئەمانە ڕیشەکێش بکات و شوێنە واریان ببڕێ و تۆیان بزربکات. ئەمانەش تاوێ بەئاشکرا خۆیان خستووەتە لوتکە وچڵە پۆپی خوایەتی و ویستوویانە ئەو خەڵکەی لەدەوروبەریاندا دەژین بەزۆر ژێر دەستە و یەخسیر بکەن، وایان لێ بکەن بۆ فەرمانی ئەوان سەردابنەوێنن و بۆ زەبروزەنگی ئەوان مل کەچ بن.. گوایە ئەمانە پشت بەو مافانە دەبەستن کە لە باب و باپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە " مافی چەوساندنەوە و ژێردەست کردنی خەڵك!! "، یاخود تەنیا ئەو چینەی کە ئەوان تێیدا دەژین ئەو مافانەی هەیە و بەدەستی کەوتووە، جا دەیان گوت ﴿ما عَلِمْتُ لَكُمْ مِّنْ إلهٍ غَيْري.﴾ (القصص:٣٨) واتە: (کەسم نەزانیوە لەمن زیاتر کەخوای ئێوە بێت) یا ﴿أنا رَبُّكُمُ الأعلى.﴾ (النازعات:٢٤) واتە: (من خوای هەرە گەورەتانم) یا ﴿ أنا أُحيي و أُميتُ .﴾ (البقرة:٢٥٨) واتە: (من دەژیێنم و دەمرێنم) یاخود ﴿مَنْ أشدُّ مِنّا قُوَّة.﴾ (فصّلت:١٥) واتە: (کەس هەیە لەئێمە بەهێزتر بێ) . ئەمانە و زۆری تری لەم بابەتانە، لەوشەکانی فیز لێدان و خۆبەگەورە زانی و لووت بەرزی و داواکاری خوایەتی کە لە دەمیان دەردەچوو زۆر بەناشیرینی و ستەمکارانە دەیانوێرا بیلێن، جارێکی تریش نەزانین و گەمژەیی خەڵکی ساویلکەیان بەهەل دەزانی و چەندان بت و پەیکەریان بۆ دادەتاشین و بۆیان دەکردن بەخوا " آلهة " و بانگی خەڵکیان بۆ دەکرد ، داوایان لێدەکردن کە دروشم

و دیاردەكانی بەندایەتی بۆ ئەم بت و پەیكەرانە بنوێنن، خۆشیان لەپـەنای ئەو بتانە حەشاردابوو و گاڵتەیان بەژیری و هۆشی خەڵكی دەكرد و دەیـان كردنە بـەندەی هـەوا و ئارەزووەكـانی خۆیـان ، كـەچی خـەڵكی سـاویلكە هەستیان بەمە نەدەكرد ، جالێرەدا بەجوانی روون دەبێتەوە كەوا بانگەوازی ئیسلام بۆ یەكتاپەرستی و دڵسـۆزی لەپەرسـتنی خوایـەكی تـاك و تـەنیا هاتووە و هەروەها بۆ ترسـاندن و دەربڕینـی نـاڕەزایی بەرانبـەر بـەكوفر و هاوبەش پەیدا كردن بۆخوا و دووركەوتنەوە لەبت و تاغووتەكان! كە ئەمانـە هەمووی لەگەڵ فـەرمانڕەوایی و ئەوانـەی كـار و فـەرمانیان دەگـێڕا یـان ئەوانەی كە فەرمانڕەواییان كردبووە پاڵپشت و یارمەتی دەر بۆ جێ بـەجێ كردنـی خواسـت و ئارەزووەكانیـان نـەدەگونجا. بۆیـە دەبینـی هـەركاتێك پێغەمبەرێك هەستابێ و بەشاكرا بانگی خەڵكی كردبێ و پێ ی گوتبێ ﴿یـا قَوْمِ أعْبُدُواْ اللّهَ مـالَكُمْ مِّـن إلـهٍ غَـيْرُهُ .﴾ (الاعـراف:٥٩) واتـە: (ئـەی قەومەكەم خوا بپەرستن، چونكە بێجگە لەو خوای ترتـان نییـە) ، هـەموو فەرمانڕەواكانی ئـەو سـەردەمە و گشـت ئەوانـەی بـەروبوومی خـەڵكیان بەهۆی زۆرداری و دەست درێژی كردن دەخوارد و خستبوویانە ژێـر دەسـتی خۆیـان، لێ ی راسـت دەبوونـەوە و دەردەچـوون بـۆ بـەرەنگاری ئـەم پێغەمبەرانە و نانەوەی كۆسپ و تەگەرە لەرێگای بانگەوازەكەیان، ئەمەش هـەمووی لەبـەر ئـەوەی بانگەوازەكـە تـەنیا بریتـی نـەبوو لـە روون كردنەوەیەكی رووت بۆ بیرو باوەڕێكی كەلامی یـاخود راڤـە كـردن و شـی كردنـەوەی مەسـەلەیەك لەمەسـەلەكانی میتـافیزیك ( الإلهیـات ) (Metaphysical Proposition)، بـەڵكو دەنگێـك بـوو بـۆ بەرپاكردنی شۆڕشێكی كۆمەڵایەتی لەجیهاندا، جا ئەوكەسانەی پلەوپایـەی گەورەیی و ناودەركردنیان بۆ خۆیان زەوت كرد بوو و سەرچاوەی سـامانیان

خستبووه ژێر دەستی خۆیـــان ، رووناکـایی ئـەم شۆڕشـەیان لیٚ بزرنـەبوو، چونکە ئەوان پێش روودانی شۆڕشەکە بەچەند ساڵێك پێشـبینی شـێواندنی باری رامیارییان دەکرد.

## خاسیەتەکانی بانگەوازە شۆڕشگێڕییەکەی ئیسلام

ئەوەی جیٚ ی گومان نییە ئەوەیە، نـێرراوانی خـوا" سـەلامی خوایـان لەسەربیٚ " گشتیان بانگکەری شۆڕش و نێرراوی نوێخـوازی و گۆڕانکـاریٚ بوون لەژیاندا، نویٚ کەرەوەی رژێمی رامیاری و کۆمەڵایـەتی و رەوشـتی و ئابووری بوون و ئەرکی گۆڕینیان بەتـەواو لەئەسـتۆ گرتبـوو، پێغەمبـەری مەزنیش (ﷺ) گەورەی ئەم بانگکەرانە و ئاڵاهەڵگریان بوو، بەڵام ئـەوەی بەشێوەیەکی روون نێرراوانی خوا لە بانگکەرانی تری شـۆڕش جیادەکاتـەوە لەجیهاندا ئەوەیە کەبانگکەرانی شۆڕش یاخود "شۆڕشگێرەکان" هـەروەکو بەو ناوە ناسراون ، هەر چەندە بیر تیژیی و رای جوان و پوختەیان هـەبێت و گەیشتبنە رادەیەکی باش لەدڵسـۆزی و نیازپـاکی!، ئـەوا نـاتوانن بگەنـە راددەیەکی تەواو و بەرز لەدادپەروەریی!، کاروبار بە تەرازوویەکی هەستیار بپێون، چونکە ئەمانە یا لـەچینی چەوسـاوەی کۆمـەڵ پێگەیشـتوون، یـا ئەوەتـە بـۆ سەرخسـتنی ئـەو چینـە مـاف خـوراو و چەوســاوانەی کـە لەدەوروبەریاندا دەژین هەستاون و داوای سەندنی مافـە خوراوەکـانی ئـەم چینانە دەکەن، جا بەحوکمی ئەو بارە نالەبار و سەختەی کەتێیدا دەژیـن ، دەڕواننـە هـەموو مەسـەلە و گیروگرفتـەکان بەسـەرنج و تـێڕوانینی لیٚ قەماوان و چینە زەحمەت کێش و زۆر لیٚ کراوەکان. لـەئاکامدا تـێڕوانینی ئەوان بۆ ئەم مەسـەلانە و رێگـەی بـیر کردنـەوەیان لەسـەر تەرازوویـەکی

دادپەروەرانە و یەکسانیەکی جیهانی گشتی و بۆ هەموو کەس وەك یەك نامێنێتەوە، بۆیە دەبینین لەلایەك بەزەییان بەچینێکدا دێتەوە و هەستی لایەنگیری و سەرخستنی بۆپیشان دەدەن، کەچی لەلایەکی ترەوە بەچاوی تووڕەیی و بێز لیّ بوونەوە و بەکەم زانینەوە تەماشای چینێکی تر دەکەن و ئەوەی لەدلیاندا هەیە لەدوژمنایەتی و رق لیّ بوونەوە، بەرانبەر ئەم چینەی دەردەخەن. جا هەرکاتێك بیریان کردبێتەوە لەچارەسەر کردنێکی یەکلاکەرەوەی یەکاویەك بۆ دەردی جەور و ستەمکاری و بیّ ویژدانی، ئەوا دەبینی زیاتر رۆیشتوون و دەردێکی کوشندە تر و زۆردار تر لە جارانیان هێناوە. کەزیاتر لەجاران لە بیّ ویژدانی و ستەمکاریدا رووچووبێت ، بەکورتی ئەمانە بەهۆی سروشتی بارودۆخ و شوێنەواریان بۆیان رێك ناکەوێت " ناکرێت بۆیان رێك بکەوێت " دلّی خۆیان لەمیکرۆبی دوژمنایەتی و تۆلّەسەندنەوە خاوێن بکەنەوە و دەروونی خۆیان لەخلّتەی چاوچنۆکی و ناکۆکی پاك بکەنەوە و رژێمێکی کۆمەلاّیەتی دابمەزرێنن کە لەسەر بناغەی داد و تەرازووی هەق و راستی خۆی گرتبێت و بەختیاری هەموو ئادەمیزاد بخاتە ئەستۆی خۆی ، بەلاّم پێغەمبەران و نێرراوانی خوا (سلاّوی خوایان لەسەر بێت) هەرگیز نابێت هیچ جۆرە سۆزێکی شەخسی پیّ بنێتە بانگەوازەکە و بزووتنەوە شۆرشگێرییەکەیان ، یاخود هەر ئارەزوویەکی ناودلّیان کە هەیانە تێکەلّ بەئیش کردن و کۆششەکەیان بێت و پیسیان بکات، هەرچەندە لەپێناوی پەیامەکەیان و لەرێ ی هەقدا بچەوسێنرێنەوە و ئازار بدرێن ، خۆیان و شوێن کەوتووەکانیان تووشی جۆرەها کارەسات و چەرمە سەری ببن، چۆن؟! کاتیّ کە ئەوانە بۆ راگەیاندنی پەیامەکەیان بەهاتنی سروش لەلایەن خوا و فەرمان وەرگرتن لەو هەستاون ، خوای گەورەش پاکە لەکەم و کورییەکانی سۆز و عاتیفەی

ئادەمیزادی و بەیەك چاو دەڕوانێتە هەموو خەڵك و هیچ کەس لای ئەو بەناز نییە، ئەویش (پاکی و پیرۆزی بۆی) وەنەبێ بێزار بێ لە چینێك و ڕقی لێ هەڵبگرێت جگە لە چینەکانی تر، لەبەر ئەوە پێغەمبەرەکانی خوا هەموویان بە هۆی ڕێنمایی کردنی خواوە بە چاوی مرۆڤایەتی پاك و بێ گەردەوە دەڕواننە هەموو کێشەو گیرو گرفتەکانی ژیانی دنیا ، هەموو غەم و بیرکردنەوەیەکیان ئەوە بوو ئایا دەبێت چ شتێك هەبێت ببێتە هۆی بەختیاری خەڵك ، بگرە هەتاکو چینە چەوسێنەرەکانیش " تا ئەو رادەیە". بە بەردەوامی تێدەکۆشان بۆ بەدیهێنانی رژێمێکی کۆمەلایەتی دادپەروەر" کە لە بازنەیەکدا" هەموو تاکێك چێژ لە مافە رەواکانی خۆی وەرگرێ ، جا لێرەدا دەبوایە ئەم مافانە بەکۆت و بەندی پێویست بەند بکرێت، تاکو پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵ لەسەر بناغەکانی راستی و دادپەروەری ڕێك بخرێن و هەریەکەیان بەشی خۆی لەم مافانەی پێ بدرێت. هەروەها بۆ ئەوەی هەرکەسێك ئەرکەکانی سەر شانی بەرانبەر کەسانی تر جێ بەجێ بکات. هەر بۆیەش دەبینی بانگەوازە شوڕشگێڕییەکەی نێردراوانی خوا نەبووەتە هۆی کێشە و ململانێ لە نێوان چینەکاندا، چونکە ئەم نێردراوانە پێکهاتی "بناء" ژیانی کۆمەلایەتیان نوێ نەکردۆتەوە بۆ ئەوەی چینێك بەرز بکەنەوە و چینێکی تر بهێننە خوارەوە، یاخود هەندێ چین لە کۆمەڵ بەسەر هەندێکی تردا زاڵ بکەن، نەخێر...، بەڵکو ئەوان ڕێگەیەکی مام ناوەندییان گرتە بەر. پێکهات و بناغەی کۆمەڵیان لەسەر بنچینەی داد و یەکسانی نوێ کردەوە تا گشت تاکەکانی نەژادی ئادەمیزاد چێژ لەمافە زگ ماك ـ خۆڕسك ـ وسروشتییەکانی خۆیان وەربگرن و ئەوپەڕی بەختیاری ماددی و گیانی بۆ خۆیان وەدەست بێنن.

## پێویستی وئامانج لەجیهادکردن چی یە؟

لێرەدا روون کردنەوەی ئەو رژێمە کۆمەڵایەتییەی کە ئیسلام هێناویەتی و ئاگادار بوون لە هەموو خاسیەت وسیفەتەکانی بە درێژی ، مەبەست نییە، هەروەها شتێکی ئاسانیش نییە بەدرێژی لەم باسە بدوێین و لەم نووسینەدا هەقی خۆی بدەینێ! ئەم باسە و ئاگاداربوون لە هەموو لایەنەکانی " گەر خوا حەز بکا" لەکاتی خۆیدا روون دەکەینەوە، جا ئەوەی دەم ویست روونی بکەمەوە و ڕاستییەکەی دەرخەم بە بۆنەی خەریك بوونمان بەم باسەوە ئەوەیە کە ئیسلام بریتی نییە لە کۆمەڵێك بیروباوەڕی کەلامی و چەند دروشم و ڕێ و شونێك " مناسك "، هەر وەکو ئێستا خەڵك لە مانای ئاین گەیشتوون ، بەڵکو لە راستیدا رژێمێکی گشتی و هەموو لایەك دەگرێتەوە " عام وشامل "، دەیەوێت هەرچەند رژێمی ناڕەوای زۆردار هەیە لەم جیهانەدا لە ناو بەرێت و ڕیشە کێشیان بکات و بیان گۆڕێتەوە بە رژێمێکی چاك و پەیڕەوێکی رێك و پێك، کەبزانێ لە هەموو رژێمەکانی تر چاکترە بۆ مرۆڤایەتی و ڕزگار بوونی ئادەمیزادی تێدایە لە دەردەکانی شەڕ و ستەم ، هەروەها بەختیاری و سەرکەوتنی هەردوو دونیای پێکەوە تێدایە. بانگەوازەکەش لەم رێگایەدا، واتە رێگای چاکە خوازی "إصلاح" و نوێ کردنەوە و ڕووخاندن و بیناکردنەوە گشتییە بۆ هەموو چین و نەوەکانی ئادەمیزاد و تایبەت نییە بە نەتەوەیەك بێجگە لەنەتەوەیەکی تر، یاتیرەیەك بێجگە لە تیرەیەکی تر، چونکە ئیسلام هەموو بەرەی ئادەمیزاد بانگ دەکات، بۆ وشە " کلمة " کەی خۆی بەڕادەیەك هەتاکو بانگی چینە زۆردارەکانیش دەکات، ئەو چینانەی دەست درێژییان کردۆتە سەر یاسا و سنورەکانی خوا لەسەر رووی زەوی و هەموو

خێرو بیری زەوییان خستۆتە ژێر دەستی خۆیان، هەروەها ئیسلام داوا لە پاشا و فەرمانڕەواکان دەکات و بەئاشکرا پێ یان دەڵێت:- لەسەر رووی زەویدا لە سنووری خۆتان تێ مەپەڕن و لەسەر ئەو سنوورانە بڕۆن کە خوا بۆ ئێوەی دیاری کردووە، دەست لەو شتانە هەڵگرن کە خوا لەئێوەی قەدەغە کردووە و ئێوەی لێ ترساندووە، جا ئەگەر ملی کەچ و پەیڕەوی فەرمان و یاسا راست و داد پەروەرەکانی خوای گەورە بوون، ئەوا بێ گومان ئێوە لە ئاسایش و حەسانەوە و هێمنی دا دەژین، چونکە هەق دوژمنداری کەس ناکات بەڵکو دوژمنداری جەور و خراپەکاری و گوناهکردن " الفحشاء " و زیادەڕەوی و لادانی مرۆڤ دەکات، کاتێ مرۆڤ لادەدات ولە سنوورە سروشتییەکانی دەردەچێت و داوای ئەو شتانە دەکات- کە بە گوێرەی یاساکانی گەردوون و ئەو سروشتەی " فطرة " خوا خەڵکی لەسەر دروست کردوو- هیچ بەشی ئەوی پێوە نییە.

کەواتە هەرکەسێ باوەڕی بەم بانگەوازە هێنا و بەجوانی وەری گرت ئەوە دەبێتە ئەندامێك لە " کۆمەڵەی ئیسلامی " یا " دەستەی ئیسلامی" کە تێیدا هیچ جیاوازی یەك نییە لە نێوان رەش و سپی، یا دەوڵەمەند و هەژار، هەموویان تێیدا یەکسانن وەك برا، هیچ نەتەوەیەك زیاتر نییە لە نەتەوەیەکی تر یا چینێك لەوەی تر، بەم جۆرە ئەم کۆمەڵە جیهانییە، یا نەتەوەگەلی " أُمَمی "یە پێك دێت کەبە زوبانی وەحی بە " حزب الله " ناو براوە. جا هەر کاتێك ئەم کۆمەڵە پێك هات، دەبێت یەکسەر دەست بکات بە جیهاد کردن بۆ ئەو ئامانجەی کە لە پێناویدا دامەزراوە، چونکە سروشت و بوونی ئەو وادەخوازێ کە نابێ هیچ کەمتەرخەمی یەك بکات بۆ لەناو بردنی ئەو رژێمە فەرمانڕەواییانەی کەلەسەر پایە و بناغەی نا ئیسلامی دامەزراون و ڕیشە کێشیان بکات و

هەموو تواناکانی بەکاربێنێت بۆ ئەوەی بیان گۆڕێتەوە بــە ڕژێمێکـی تـری مام ناوەندی ڕێك وپێك بۆ ئاوەدانی و کۆمەڵایەتی کە لەسەر بناغەی ئـــەو یاسا مام ناوەندی یە ڕێك وپێك و دادپەروەرە دامـــەزرابێت ، کـە قورئـانی پیرۆز بە" کلمة الله" ی ناو دەبات، جا ئەگەر هاتوو ئەم کۆمەڵەیە بەپێ ی توانا ئەرکەکانی خۆی نەبەخشی و تێ نەکۆشا بۆ گۆڕینـی ڕژێمـە فـەرمان ڕەوایەکان و دامەزراندنی ڕژێمی هەق ، ئەو ڕژێمەی کە لەسەر بناغـــەکانی ئیسلام دارێژراوە و بەپێ ی پێویست لـەم ڕێگایـەدا جیـهادی نـەکرد، بـێ گومان ئەو هیوا و ئامانجەی کە کۆمەڵەکە لە پێناویا دامــەزراوە لەدەسـت دەچێت، چونکە خۆی تەنیا بۆ گەیشتن بـەم ئامانجـە مەزنـەو ئـەو ئاواتـە پیرۆزە دامەزراوە، ئەویش ئاواتی دامەزراندنی ڕژێمی هەق و دادپەروەرییە، کە جگە لەمە نابێ هیچ ئامانج و کارێکی تری هـــەبێت ، ئەمــەش تـەنیا ئامانجە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونی کردۆتەوە:

﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ وَتَنْـهَوْنَ عَـنِ الْمُنْكَـرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللهِ.....﴾ (آل عمران : ١١٠).

واتە: (ئێوە باشترین نەتەوەن دەرچـــوون بــۆ خـەڵك فــەرمان بــە چاکـە دەکەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و باوەڕتان بە خوا هەیە).

وەنابێ کەس واتێبگات ئەم کۆمەڵە کە بەزوبانی وەحی بە"حزب الله") ناوبراوە، بریتـــین لــە کۆمــەڵێك ئامۆژگاریکــەر و مــژدەدەر"مبشّـر" کـە ئامۆژگاری خەڵك دەکەن لە مزگەوتــەکان و بانگیــان دەکــەن بــۆ ڕێبــاز و مەزهەبەکانیان بـــە دوانــدن" خوتبــە" و وتــار، نــەخێر !! بــەڵکو ئــەم کۆمـەڵەیە خوای گەورە دایمەزراندووە بۆ ئەوەی ئــاڵای هــەق و دادپــەروەری هەڵگرێ و ببێتە شاهید لەسەر خەڵك . لەو ئەرکەی کە لەســەر شــانێتی و لەیەکەم ڕۆژەوە پێ ی سپێردراوە ئەوەیە کــە دەبێـت سـەرچاوەی خراپــە و

دەست درێژی کـردن نـە هێڵێـت و ڕەگ و ڕیشـەی سـتەم و خراپـەکاری و چەوسـاندنەوە لەسـەر ڕووی زەوی دەربێنێـت و جڵـەوی ئـەم بـت و خـوا دەستکردانەی کە بە ناهەق لەسـەر ڕووی زەوی لـووت بـەرزییان لیٚ دەدا و خۆیان کردبووە پەروەردگار لە جیاتی خوا بگرێت و ڕەگ و ڕەچەڵەکی ئـەم خوایەتییەیان لە بنەڕەتەوە دەربهێنێت و ڕژێمێکی نویٚ بۆ فـەرمانڕەوایی و ئاوەدانی دامـەزرێنێت، کـە لەسـێبەرەکەیدا دوور و نزیـك، دەوڵەمـەند و هەژار بحەسێنەوە. هەر بۆیەش، قورئانی پیرۆز زیاتر لەچەند شـوێن دەست نیشانی ئەم مەبەستەی کردووە، هەر وەکو دەفەرمووێ:

﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاتَكُوْنَ فِتْنَةٌ وَيَكُوْنَ الدِّيْنُ كُلُّهُ لِلّهِ. ﴾ (الأنفال: ٣٨).

واتە: (شەڕیان لەگەڵ بکەن تاکو کوفر و شرك نەمێنیٚ و خواپەرسـتی و حوکمیش هەمووی بۆ خوا بێت).

﴿إلاَّ تَفْعَلُوْهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيْرٌ .﴾ (الأنفال:٧٣).

واتە: (ئەگەر ئێوە پشتی یەك نەگرن ئەوا فتنە و فەسادی گەورە لەسەر ڕووی زەوی بڵاودەبێتەوە ).

﴿هُوَالَّذِي أَرْسَلَ رَسُوْلَهُ بِالْهُدَى وَدِيْنِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَـى الدِّيـنِ كُلِّـهِ وَلَـوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُوْنَ. ﴾ (التوبة:٣٣).

واتـە: (خـوای گـەورە پێغەمبەرەکـەی خـۆی نـاردووە بەهیدایـەت و ڕێنموونی و ئـاینی ڕاسـتەقینە تـاکو سـەرکەویٚ بەسـەر هـەموو ئـاینێك هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرەکان پێیان ناخۆش بیٚ).

لەم ئایەتانەدا ڕوون بۆوە کە پێویستە ئەم کۆمەڵە جڵەوی کاروبار بگرنە دەسـت و هیـچ سـەیریش نییـە ئەگـەر بێـت و دەسـت بەسـەر جڵـەوی فەرمانرەواییشدا بگرن، چونکە ڕژێمی بەناو ئاوەدانی گەندەڵ خـۆی نـاگریٚ تەنیا لەسەر ئەسـاس و بناغـەی فەرمانڕەواییـەك نـەبێت ، کـە ئـەمیش

لەبنەڕەتدا لەسەر دەست درێــژی کـردن و خراپـەکاری وەسـتاوە، هـەروەها شتێکی ئاشکراشــە نـاتوانرێت رژێمـی چـاك و گونجـاو بـۆ فـەرمانڕەوایی دابمەزرێت ، تـەنیا کـاتێك جڵـەوی کـار وبـار لەدەسـت ستەمکارە پیـاو خراپەکان دەسێنرێتەوە و دەکەوێتـە دەسـت کۆمـەڵێ کەسـانی چـاك کـە باوەڕیان بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە و مانەوەی خراپەکاریان ناوێ لەســەر رووی زەوی.

لەمە زیاتر ئەم کۆمەڵە، بێ تەماشـاکردنی ئـەو شـتانەی کەدەیانـەوێ وەك چاکەخوازی بۆ جیهان و بڵاوکردنەوەی رەوشتی چاك و جوان لـە چـوار چێوەی زەمیندا بەگشتی ناتوانێت لەسەر پلانەکەی جێگیربێت و دەست بـە پەیڕەوەکەی خۆی بگرێت و بە گوێرەی ئـەو ئیـش بکـات، مـادام رژێمـی فەرمانڕەوایی لەسەر بناغەیەکی تر دامــەزرابێت و بـەگوێرەی پـەیڕەوێکی تری جیا لە هی ئـەو بـەڕێوە بـڕوات، چونکـە کومـەڵێك کـە بـاوەڕی بـە بنچینەو رژێمی تایبەتی خۆی بـۆ فـەرمانڕەوایی هـەبێت، نـاتوانێت ژیـان بباتە سەر و بەردەوام بـێ لەسـەر دەسـت گرتـن بـە بنچینەکـەی خـۆی و بەگوێرەی ئـەو ئیـش بکـات ، ئەگـەر بێتـوو لەسـێبەری رژێمێکـی تـری فەرمانڕەوایی کە لەسەر بنچینە و ئامانجی جیـا لـەو بنچینـە و ئامانجانـە دامەزرابێت کـە ئـەم کۆمەڵەیـە بـاوەڕی پـێ دێنـێ و دەیـەوێ لـە سـەر پەیڕەوەکەی بڕوات.

جا بۆ نموونە یەکێك کە باوەڕی بە بنچینەکانی کۆمۆنیستی هێنـابێت و بیەوێ ژیان لە بــەریتانیا و ئـەڵمانیا[٣] بباتـە سـەر بـەجۆرێك دەسـت لـە

---

[٣] ئەم ووتارە لە ساڵی ١٣٥٨ك-١٩٣٩ز نووسراوە پێش هەرەس هێنانی کۆمۆنیست و بلۆکی رۆژهەڵات.

بنچینەکانی خۆی بەر نەدات و بەگوێرەی ئەو بەرنامەیە کە کۆمۆنیستی بڕیاری لەسەرداوە ژیان بباتە سەر بێگومان هەرگیز ئەمەی پێناکرێت، چونکە ناچاردەبێت بکەوێتە ژێر رکێف و دەسەڵاتی ئەو رژێمانەی کە سەرمایەدار و نازی یەکان دایان ناوە. دەسەڵاتی ئەمانەی هەموو بە سەر زاڵە و هەرگیز ناتوانێ لە چنگ و چەپۆکیان رزگاری بێت، هەروەها ئەگەر موسڵمانێك ویستی ژیانی خۆی لە ژێر سێبەری رژێمێکی فەرمانڕەوایی دژ بە بنچینە نەمرەکانی ئیسلام بباتە سەر پاشان بیەوێ دەست بە بنچینە نەمرەکانی ئیسلام بگرێت و بەگوێرەی پێداویستیەکانی ئەو بڕوات لە ژیانی رۆژانەیدا، ئەوا بێگومان هەرگیز ئەمەی بۆ ناچێتە سەر و لەمەدا سەرکەوتوو نابێ، چونکە ئەو یاسایانەی دەیبینێ هەمووی ناڕەوایە، دڵنیایە لەوەی ئەو باجانەی کە لە ماڵی خەڵك دەسێنرێ هەمووی تاڵان و غەرامەن ، هەروەها زۆر چاك دەزانێ ئەو کێشەو مەسەلانەی لەدادگاکان بڕیاریان لەسەر دەدرێت لەهەق و راستی دوورن و دەرچوونن لە تەرازوو و سنوورەکانی داد پەروەری و ئەو رژێمانەی کە سوڕ دەزانێ سەرچاوەی خراپەکارین لە سەر رووی زەوی و هەروەها ئەو پەیڕەوانەی دوارۆژەکەیان رەشە و ئەنجامێکی پیسیان هەیە و فەوتاندنی میللەت و نەتەوەیان لە چاودایە بەسەریدا زاڵ بوونە و خۆیان سەپاندووە بەسەر شوێنەوار و خێزان و منداڵەکانی. بە جۆرێك ناتوانێت لەدەست ئەم کۆت و زنجیرانە دەرباز بێت و فریای خۆی و خێزانەکەی بکەوێ و لە کاریگەری و دەسەڵاتی ئەمانە رزگاریان بکات. ئەوەی بڕوای بە بیر و باوەڕ و رژێمێك هێنا بێ، جا چ یەکێك بێت یا کۆمەڵی بە هۆی سروشتی ئەو بیرو باوەڕەی کە باوەڕی پێ هێناوە و ناچاردەبێ تێبکۆشێ بۆ لە ناوبردنی ئەو رژێمە فەرمانڕەوایەی کە لەسەر فیکرەیەکی جیا لە فکرەکەی ئەم دامەزراون،

دەبێت بەپێ ی ئەو توانایەی کەهەیەتی ئەرکی خۆی بەکار بێنێت بۆ دامەزراندنی رژێمێکی فەرمانڕەوایی لە سەر ئەو فیکرەیەی خۆی باوەڕی پێ هێناوە و دەزانێ بەختیاری ئادەمیزادی تێدایە. چونکە هیچ دەرفەتێکی وای نییە تاکو بتوانێت بەپێ ی بیروباوەڕەکەی خۆی ئیش بکات و لەسەر پەیڕەوەکەی بڕوات، تەنیا بەم ڕێگایە نەبێت! جا ئەگەر بینیت یەکێك بۆ ئامانجەکەی خۆی تێ ناکۆشی و خۆی گێل دەکات لەو ئەرکەی لەسەر شانیەتی، بێ گومان بزانە ئەو کەسە لەداوا کارییەکەی درۆزنە و هێشتا باوەڕیش نە چۆتە ناو دڵی هەروەکو ئەم مەبەستە لە قورئان هاتووە:

﴿عَفَا اللهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِيْنَ صَدَقُوْا وَتَعْلَمَ الكَاذِبِيْنَ، لا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِيْنَ يُؤْمِنُوْنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ وَاللهُ عَلِيْمٌ بِالْمُتَّقِيْنَ إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِيْنَ لا يُؤْمِنُوْنَ بِاللهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوْبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُوْنَ .﴾ (التوبة:٤٥).

واتە: (خوا لێت ببورێ چۆن رێگەتدا بڕۆن پێش ئەوەی بزانی کامەیان ڕاست گۆیە و کامەیان درۆزنە، ئەوانەی بڕوایان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە هەرگیز ئیزن وەرناگرن لێت، بەڵکو دەچن جیهاد دەکەن بەماڵ و نەفسیان و خوای گەورە ئەوانە دەناسێ کە پیاو چاکن و لێ ی دەترسن، بەڵکو ئەوانە داوای ئەوە دەکەن کە نەچن بۆ جیهاد و بگەڕێنەوە کەوا بڕوایان نییە بە خواو ڕۆژی دوایی و دڵیان گومانی تێدایە و لەو گومانە دوودڵن).

ئایا چ شایەتی یەك لەمە ڕاسترە و چ بەڵگەیەك هەیە لەمە جوانتر و ڕوونتر لەشایەتی و بەڵگەی قورئان؟!

لەم ئایەتانەدا لە سوورەتی " براءة " قورئانی پیرۆز بڕیاری داوە:

" ئەو کەسەی بە پیر بانگی جیهاد کردن نەیەت جیهاد نەکات بە مـــالْ و گیانی لەرێگای بەرزکردنەوەی وشەی خواو دامەزراندنی ئەو ئاینـــەی کـە خـوای گـەورە بـۆ خـۆی لیّ ی رازی بـــووە و چەســـپاندنی ئـــەو رژێمـــە فەرمانڕەوایيەی کەلەسەر بناغەی ئەم ئاینە دامـــەزراوە، ئـــەوا ئـــەو کەســـە دێتە ریزی ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە، دڵیان گومانی تێدایە و بەهۆی ئەم گومان کردنەوە تووشی دوودڵی و دڵە خورپە بوون. جا ئەو کەسەی سەر بۆئەو رژێمە فەرمانڕەوایەی کە لەسەر فیکرەیەکی جیا لە فیکرەی خۆی دامەزراون دابنەوێنیّ، وەك ئەمە وایە کە بە ئاشکرا بەخەڵك رابگەینیّ کە خۆی درۆزنە لەداواکەی و بۆ بیرو باوەڕەکەی دڵسۆز نییە" .

جا شتێکی ئاساییە لە ئەنجامی ئەم ملکەچی و سەردانواندنە مرۆڤی وا بیروباوەڕەکەی لەجیّ ی خۆی دەخـزیّ و نـامینیّ و پـیّ بـە پـیّ بـەرەوخاو بوونەوە دەڕوات، لەوەندە بڕوایەی کـە کـە رەنگـە لـە دڵیـدا مـابیّ پـاش خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەم رژێمـە ناڕەوایانـە و مـل کـەچی نوانـدن بۆیـان ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تۆ لەسەرەتادا بۆ ئەم رژێمانە تەسلیم دەبی کـــە چـی دڵت پیّ ی ناخۆشە، پاشان رۆژ بە رۆژ دڵت لە گـەڵیاندا رادێـت و وای لیّ دیّ پێیان دڵنیادەبی و تێیاندا دەحەسێیەوە و لەدەروونی خۆتا هەسـت بـە بۆچوون و شەوقێك دەکەیت بۆیان، پاشان پیّ بەپیّ بۆیان دەچی و بیّ ئەوان ناحەسێیتەوە تا دوایی دەبیە پاڵپشـــت و یارمـــەتی دەریـان بـۆ سـەپاندنی کۆڵەکەکانی ئەم رژێمە ناڕەوایانە و هەڵسوڕاندنی کاروباریان ، تـا رۆژێـك بەسەرتا دێت هیچ درێغی ناکەیت لـــە بەخشـین و بـەخت کردنـی نـەفس و نایابترین شتی خۆت لەپێناوی دامەزراندنی کۆشـــك و تـەلاری ئـەو بـیرورِا ناڕەوایانە و پتەوکردنی بناغەیان، بەگرانی نازانی بکەویتە خەبات کردن بە خۆت و بەوەی لەدەستت دێت بۆ روخاندنی کۆڵەکەکانی ئیســـلام و لادانـــی

خەڵك لە ڕێ ی هەق و داد پەروەری جا ئەگەر کار گەیشتە ئەو ڕادەیە، لێرەدا هیچ جیاوازی نامێنێ لەنێوان ئەو مرۆڤەو گاورێکدا تەنیا ئەوە نەبێت ئەو گاورە و دوژمنایەتی و قینی خۆی ئاشکرا دەکا، بەڵام ئەم دووڕووە لێزانە و بۆ ڕیاکاری و درۆ ناوی ئیسلامی لەخۆی ناوە و ئەوەی دەیلێ خۆی باوەڕی پێ ی نییە و ڕاست ناکات و درۆ بەزاری خواوە هەڵدەبەستێ و بۆ ئەم مەسەلەیەش پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی دەست نیشان کردووە هەر وەکو دەگێڕنەوە فەرموویەتی ((والذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر ولتأخذن على يد المسيء ولتأطرنه على الحق أطراً أو لَيضرِبَنَّ اللهُ قلوبَ بعضكمْ على بعضٍ ثمَّ يلعنكمْ كما لعنهمْ))[٤] واتە: ( قەسەم بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە ئێوە دەبێت فەرمان بەچاکە و قەدەغە لەخراپە بکەن و دەبێ دەستی خراپەکار بگرن و بیهێننەوە سەر ڕێ ی ڕاست، ئەگەرنا خوای گەورە هەندێکتان دەکاتە دوژمنی هەندێکی ترتان و پاشانیش لەعنەتان لێ دەکات هەروەکو لەعنەتی لەپیاو خراپەکان کردووە).

## ئیسلام شۆڕشێکی جیهانی بەربڵاوە

هیوادارم لە باسی پێشوومان بۆت ڕوون بوبێتەوە کە ئامانجی "جیهاد کردن لەئیسلام " بریتییە لە ڕووخاندنی ئەو ڕژێمانەی کەلەگەڵ بنچینەکانی ئەودا دژایەتییان هەیە و گۆڕینەوەیان بەفەرمانڕەواییەکی تر کە لەسەر بناغەکانی ئیسلام دامەرزابێت ، لەجێگەی ئەواندا. ئەم

---

[٤] - ترمذي و أبوداود ابن و ماجە لەچەند ڕێ ی جیاوازەوە ڕیوایەتیان کردووە. بڕوانە تەفسیری ابن کثیر ج٢.. ل٨٢.

ئەرکەش واتە ئەرکی رووداني شۆڕشـێکی ئیسـلامی گشـتی، نەبەسـتراوە بەولاتێك بێجگە لـەولاتێکی تـر، بـەلکو ئـەوەی ئیسـلام بەتەمایـەتی و لەبەرچاوی خۆی داناوە ئەوەیە پێویستە ئەم شۆڕشە لەهەموو سـووچەکانی رووی زەویدا روویدات. ئەمە بەرزترین ئامانج و پـیرۆزترین مەبەسـتە کـە ئیسلام چاوی تێبڕیوە، ئەگەرچی نابێ ئـەوەمان لـەبیر بچـێ کـە پێویسـتە لەسەر موسڵمانەکان یاخود " ئەندامانی کۆمەڵەی ئیسلامی" بـۆ دەست پێ کردنی ئەم ئەرکە، واتە ڕووداني ئەم شۆڕشە چاوەڕوان کراوە و تێکۆشان بۆ گۆڕینی رژێمی فەرمانڕەوایی، یەکەم جار لەو وولاتەی کە تێیـدا دەژیـن دەست پێ بکەن. بەلام دەبێت گەورەترین ئامـانج و بـەرزترین مەبەسـتیان ئەو شۆڕشە جیهانی و گشتییە بێت کە هەموو گێتـی بگرێتـەوە، چونکـە ئیسلام خۆی فیکرەیـەکی شۆڕشـگێرییە و بـاوەڕی بـە نەتەوایـەتی نییـە، بەلکو بەگشتی بانگی خەلك دەکات بۆ بەختیاری ئادەمیزاد و ڕزگار بوونی ، جا لەبەر ئـەوە ناشـێ بازنـەی ئیـش کردنـی خـۆی تەسـك کاتـەوە لـە چوارچێوەیەکی دیاری کراو لەنەتەوەیەك یان ولاتێکـدا، بـەلکو لەراسـتیدا بەحوکمی سروشت و دروست بوونی ناچارە شۆڕشی جیهانی بکاتە ئامـانجی رەچاوکراوی خۆی ، بەمەرجێ هیچ ساتێك لێ ی غافڵ نەبێ ، چونکە هەق رازی نابێ بە سنووری جوگرافـی و نایـەوێ پـەنگ بخـوات لـەنێوان چـەند سنوورێکی تەسك کە زانایانی جوگرافی نەخشەیان بۆ کێشاوە و ناویـان لێ ناوە. چونکە هەق ژیری ئادەمیزادی پاك دەبزوێنێ و داوای مافی خۆی لێ دەکات و دەڵێت: (ئێوە چیتان بەسەر هاتووە؟ دەڵێن فلانە کێشـە!! راسـتە لە دیوێکی ئەم چیایە یا رووبارە کەچی هەمان کێشە بەقسەی ئێوە دەبێتە نارەوا ئەگەر بێتو لەم چیایە یا رووبارە بپەڕیتەوە بەچەند پـێ یـەك) هـەق هـەر هەقـە لـە هـەموو بـار و دۆخ و شـوێنێکدا، ئایـا چیـا و ڕوبـار چ

کاریگەرییەکی هەیە لەسەر گۆڕینــی راستێتییە مەعنەوییەکـەی ، هـەق سێبەرەکەی گەورەیە و فراوانە و خێر و چاکەکەشی گشتییە و تایبەت نییە بە شوێنەوارێك و شــوێنەوارێکی تـر نەگرێتـەوە یـا وولاتێـك بێجگـە لـە وولاتێکی تر، جا ئەگەر هاتوو لەهەر شوێنێك مرۆڤێکی چەوســاوە بیـنرا، ئەوا لەسەر هەق پێویستە بێت بەهاواریەوە و مافەکـــەی بـۆ بسـێنێتەوە و سەری بخا، هەرکاتێك مرۆڤایەتی لەپێناوی رۆڵـە چەوسـاوەکانیدا تووشـی تەنگ و چەڵەمە هات ، پێویسـتە لەســەر داد و بنچینـەکانی و ئەوانـەی ئالاکەیان هەڵگرتووە، بەتەنگ هاواریەوە بچن تاکو سەری دەخـــەن بەســەر دوژمنە زۆردارەکانی و ئەو مافە زەوت کراوانەیان بۆ دەگەڕێننەوە، کە بـــە زوڵم و زۆرداری بەدەستی ستەم کارەکان شێلراوە، هەر بەم مانایەش زوبانی سروش فەرموویەتی ﴿وَمَالَكُمْ لا تُقَاتِلُوْنَ فِي سَبِيْلِ اللهِ وَالَمُسْتَضْعَفِيْنَ مِـنَ الرِّجَـالِ وَالْوِلْـدَانِ الَّذِيْـنَ يَقُوْلُـوْنَ رَبَّنَـا أَخْرِجْنَـا مِـنْ هَـذِهِ الْقَرْيَــةِ الْظَّـالِمِ أَهْلُهَا....﴾ (النساء:٧٥). واتە: ( بۆچی شــەڕ ناکـەن لـە پێنـاوی خـوا و چەوساوەکان لە پیاو و ژن و منالْ کە دەڵێن خوایە رزگارمان کـە لەدەسـت ئەم شارە کە خەڵکەکەی زاڵمن).

سەرباری ئەمەش ئەو پەیوەندییە مرۆڤی و ئادەمییانە، هەرچەندە جیـا کەرەوەی نەتەوایەتی و نیشتمانی کاری تێکردوون و ئارەزووی پـەرت بـوون و لێك نەچوونی تێدا دروست کردوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا گونجـاندنێکی تەواو و لێکچوونێکی" تجانس " گشتی لەنێوانیاندا هەیەو رەنگە لەتواناندا نـەبێت و گـران بێـت بـۆ ولاتێـك لـە هـەرێمێکی تایبـەتیدا بـە گوێـرەی بنچینەکەی و پلانە نەخشە کێشراوەکەی خۆی بەڕێوە بڕوات ، مادام ولاتـە هاوسێکانی رازی نەبن لەسەر پلان و بنچینــەکانی و رازی نـەبن بەڕۆیشـتن بەگوێرەی پەیڕەو و بەرنامەکەی ، جا بۆیە پێویستە لەسەر ئەم کۆمەڵـە

موسلمانە بۆ پارێزگاری لەقەوارەی خۆی و لەپێناوی چاکە خوازییەکی بەتەماکراودا، رازی نەبێ بەدامەزراندنی رژێمی فەرمانڕەوایی ئیسلامی لەتاکە ولاتێ بەتەنیا، بەڵکو ئەوەی ئەرکی سەرشانێتی و بە هیچ جۆرێ ناتوانێ لیێ ی لادا ئەوەیە کە پێویستە ئەو ئەرکەی هەیەتی کۆی بکاتەوە و بیخاتە کار بۆ فراوان کردنی مەودای ئەو رژێمە و بلاوکردنەوەی دەسەلاتەکەی بەهەموو لایەکی رووی زەویدا، جا لە لایەك پێویستە لەسەر ئەم کۆمەڵە ئیسلامییە بۆ بلاوکردنەوەی بیرۆکەی ئیسلامی و بیردۆزەکانی بەشێوەیەکی تەواو تێبکۆشێت ، هەروەها بۆ بلاوکردنەوە و گشتی کردنی ئەم چەمکانە لەسەرانسەری گێتیدا خەبات بکات و داوا لەدانیشتووانی رووی زەوی بکات، سەرباری ئەو جیاوازی یانەی لە نێوانیاندا هەیە لەبارەی وولات و ڕەگەزو چینەکانیان، تاکو ئەم بانگەوازە قبوولێ بکەن و مل کەچ بن بۆ ئەم پەیڕەوەی کەکامەرانی هەردوولا، دونیا و ڕۆژی دوایی یان دابین دەکات، لەلایەکی ترەوە قۆلی خۆی لیێ هەلکا بۆ بەربەرەکانێ ی ئەم رژێمە ستەم کارانەی کە لەگەلێ بناغەی هەق و داد پەروەری ناگونجێن، بەهۆی زەبر و زۆرەوە ،جا ئەگەر ئەمەی توانی و کەرەسەی خۆی بۆ ئامادە کرد، دەبێ لەجێگای ئەمانە رژێمێکی تری دادپەروەر و بێ لایەن دابمەزرێنێت، کە بناغەکەی لەسەرپایەکانی ئیسلام و بنچینە نەمرەکانی دارێژرابێت، ئەو بنچینانەی کە تا شەو و ڕۆژ مایە لەناو ناچێ و هەردەم نوێیە، ئەمەبوو ئەم رێباز و پلان و نەخشەی کە پێغەمبەر (ﷺ) گرتییە بەر، ئەو پەیڕەوەی خۆی و خەلیفە راشیدەکان پەیڕەویان کرد، ئەوانەی کە لەدوای ئەو هاتن و لەسەر پەیڕەوی ئەو رۆیشتن، جائەوانە دەستیان بەولاتی عەرەب کرد، کە رۆژی ئیسلام لەئاسۆیدا هەلاتبوو. بۆ یەکەم جار خستیانە ژێر فەرمانڕەوایی ئیسلام و هێنایانە ژێر سێبەری دەولەتی ئیسلامی نوێ،

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی پاشاو میرو سەرکردەکانی هـەموو هەرێمـە جیاجیاکانی رووی زەوی کرد، بۆ ئاینی هەق و سـەردانواندن بـۆ فـەرمانی خوا، جا ئەوانەی باوەڕیان بەم بانگەوازە هێنا و چوونە ریزی ئـەم دەوڵەتـە ئیسـلامییە بـوون بـە هـاوولاتی و هاونیشـتمانی ، ئەوانـەی بـەپیر ئـەم بانگەوازەوە نەهاتن و بەجوانی قبوولیان نەکرد کەوتە شەڕ کردن و جیـهاد کردن لەگەڵیاندا. پاشان کە ئەبو بەکر (ﷺ) کرا بە جێ نشین دوای کۆچـی یەکجارەکی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕۆیشتنی بۆلای خوا، ئـەبو بـەکر دەسـتی کرد بەهەڵمەت بردن بۆ ئەو دوو دەوڵەتـە هاوسێیەی دەوڵـەتی ئیسـلامی واتە دەوڵەتی رۆم و فارس، کەئەم دوو دەوڵەتە دەرچونیـان لـەڕێ هـەق و نقوم بوونیان لەسـەرگەردانی و زۆرداریـدا لەسـەر رووی زەوی دونیـای پـڕ کردبوو، جا ئەو هێرشانەی کە ئەبو بـەکر دەسـتی پـێ کـرد لەسـەردەمی فاروقدا گەیشتە ئامانجی خۆی و چاکەی گەورەی چەسپاندنی کۆڵەکـەکانی دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ئەمە و کـەچی دانیشـتوانی وولاتی میسر و شام و ڕۆم و فارس وا چو بووە مێشکیان کـە ئـەم شـالاوە یەك لەدوای یەکەی عەرەبەکان و ئەو فتوحاتە پیرۆزانەی کردیان، کەمایەی شانازی و گەورەیین " بێ زیاد کردن "، ئەمانە تەنیا پلانێکی بەندەکردن و ئیستعماری بوون و عەرەبەکان ئەمەیان بەرز کردبۆوە و کردبویانە دروشم و ئاینی خۆیان، وەکو چۆن نەتەوە زۆردارەکانی سەردەمی پێشوو دەیان کـرد، وایان دەزانی کە فتوحات و غەزەواتی عەرەبەکانیش وەکو هی نەتـەوەکانی تری پێشوو وایە کەلە وولاتی خۆیان دەردەپەڕین و میللەتـە ژێـر دەسـت و چەوسـاوەکانیان دەکـردە بـەندەی خۆیـان و بـەقامچی سـەرکوت کـردن و تیژڕەوی راپێچیان دەدان و وەك چۆن ووشترەوان رەفتار لەگـەڵ ووشـترەکانی خۆی دەکات، عەرەبەکانیش بەم جۆرە هەڵس وکەوت لەگەڵ گیان و ماڵیان

دەکەن، بۆیە دەبینی لەسەرەتادا ئەو میللەتانە چوونە ژێر ئالآی پاشـــاکانی رۆم و فارس، خۆیان کردە سەرباز لە لەشکرەکانیان و هاتنە مەیدان بۆ شەڕ کردن لەگـەڵ موسـڵمانەکان، بـەڵام لـەدواییدا لەمەبەسـتی موسـڵمانەکان گەیشتن و بۆیان روون بۆوە ئـــەو هۆیــە چیــە وای لەموسـڵمانەکان کـردووە وڵاتی خۆیان بـــەجێ بـهێڵن و لــەو پـەیڕەوە شۆڕشـگێڕییە گشـتییەی کـە دەیانەوێ جیهانی پێ رزگار بکەن شارەزابوون، کاتێ بۆیان دەرکـــەوت ئـــەم عەرەبانــە داوای ســتەمی نەتەوایــەتی ناکــەن و دەروونیـــان بەمەبەســـتە پیسەکانی نەتەوایەتی گڵاونەبووە و وڵاتی خۆیان بەجێ نەهێشـــتووە تـــەنیا بۆ دامەزراندنی رژێمێکی فەرمانڕەوایی نەبێت ، کە لەسەر بناغـــەی داد و بـێ لایـــەنی بنیـــاد نرابـێ ، شـیریان لەکالآنـــەوە دەر نـــەهێناوە تـــەنیا بـــۆ لەنابردنی ئەو چینە بێ ویژدان و زۆردارانە نەبێت، کەتەنیا بۆ بـــەرژەوەندی خۆیان دەستیان بەسەر دەرامەتی دەوڵەمەندی و ئاسوودەیی گرتووە و گەلە ژێر دەست و زەحمەت کێشەکانیان لیّ بێ بەش کردووە و ناخۆشـترین جـۆرە ئازار و ئەشـــکەنجەیان دەرخـــوارد داون لـــەژێر ســـایەی رژێمـــی کیســـرەوی و قەیسەریدا و لەســـەر رووی زەوی بەســـەرگەردانی و ســـتەم کارانـــە شـــوێن و پایەی خوایەتیان گرتۆتـــەوە، کـــاتێ هـــەموو ئەمانـــەیان بـــۆ ئاشـــکرا بـــوو، بەچاوی خۆیان بارو دۆخی هەڵمەت بەرە موســـڵمانەکانیان بینـــی و ئاکـــارە پەسندەکانیان بە جوانی بۆ روون بۆوە، ئەو کاتە بە سروشتی خۆیـــان بـــەرەو کۆمەڵەی ئیسلامی هاتن و دەستیان کرد بەڕاکردن لەسوپای رۆم و فـــارس.
جا ئەگەر لە دواییشدا بەشـداربیان کردبـێ لەشـەڕ کـردن لـە ریـزی رۆم و فارسەکان، بێ گومان ئەوا ناچـــار بـــوون بـــارو دۆخـــی دەوروبـــەر وای لـــێ کردوون و خۆشیان لەدڵدا لۆمەی خۆیان کردووە. ئیتر لـــێرەدا دەزانـــی ئـــەو هۆیە چیبووە کە یارمەتی موسڵمانەکانی داوە بۆ ئەم سەرکەوتنە دلێرانە و

ئەو فتووحاتە مەزنانەی کەلەسەرەتای جـەنگ و غـەزاکانیاندا وەدەسـتیان هێناون. بۆیە دەبینی کاتێ دانیشـتوانی ئـەم وولاتانـە بینییـان دەوڵـەتی ئیسلامی بەگوێرەی بنچینەکانی دەڕوات بەڕێوە، کەلەسەر یاسای داد و بێ لایەنی دامەزراوە و بینییان کەرژێمی کۆمەلایەتی لە ئیسلامدا چۆن کـارو باری خۆی لەپێش چاوی ئەمان بـەڕێوەدەبات و بینییـان کەئـەم رژێمـە چ کامەرانی و دڵنیایی یەکی پێ گەیاندوون، ئەم هەموو شتانە وای لێ کـردن کەشوێن ئەم بانگەوازە بکەون و کۆمەڵ بە کۆمەڵ یان یەکە یەکە بچنە ناو شیرازەی ئەم کۆمەڵە جیهانییەوە، خۆیان بخەنە ژێر ئالاکەی، وای لێ هـات خۆیان ئالاکە هەلگرن، ئالای چاکـە خوازیـی گشـتی و شۆڕشـی جیـهانی، بـەرەو زۆربـەی وڵاتـە دوورەکـانی رووی زەمـــین کەوتنـــە رێ و بـــانگی خەڵکەکەیان دەکرد بۆ هاتنە ناو ئەو رژێمەی کە بـــەختیاریی ئـادەمیزاد و تامەزرۆ لە خێر وبەروو بوومەکەی خستۆتە ئەستۆی خۆی.

## شیاونییە جیهاد جیابکرێتەوە بۆ هێرش بردن و بەرگری

ئەگەر بێت و بەوردی سەیری ئەو باسەی کەدەست نیشانم کرد بکەیت و بە قووڵی بچێتە ناخییەوە ئەوا بە جوانـــی بـۆت دەردەکـەوێت کـە ئـەوەی خەڵك لەسەری راهاتوون لە جیاکردنەوەی شەڕکردن " القتال " بـۆ هـێرش بردن (Offensive)و بـەرگری کـردن (Deffensive) هـەرگیز بـۆ جیـهادی ئیسـلامی نـاگونجێت، چونکـە ئـەم زاراوەیـە تـەنیا بـۆ شـەڕی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری راستە، هەروەها تەنیا بۆ وڵاتێکی تایبەتی یا نەتەوەیەکی تایبەت بەکار هاتووە، ئەگەر هات و کۆمەڵەیەکی جیـهانی پێ ی هەستا کە پاڵی دابوو بـە بیرۆکەیـەکی شۆڕشـگێڕی گشـتی و هیـچ

جیاوازی نەدەکرد لەنێوان میللەتێك و یەکێکی تر و تایبەت نەبوو بەولاتێك جگە لەولاتێکی تر. هەموو گەل و نەتەوەیەکی بانگ دەکرد بۆبیرۆکە و رێبازەکەی خۆی بەبێ جیاوازی نەژاد و زمانیان . دەرگای والا بوو بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت بەشداری بکات لەراگەیاندنی ئەم بانگەوازە و بلاکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە و تێکۆشانی تەنیا بۆ لابردنی ئەم فەرمان رەواییە ستەمکارانە بوو، کەلەگەڵ بنەماکانی هەق و دادپەروەری دژن، ئەو بنەمایانەی کە ئەم کۆمەڵەیە باوەڕی پێ هێناوە و بانگی خەڵکی بۆ دەکات. جا ئەگەر هاتوو مەسەلەکە وابێت لێرەدا هیچ رێگەیەك نییە بۆ جیاکردنەوەی جیهاد بۆ هێرش بردن و بەرگری کردن، هەروەکو خەڵك لەسەری رۆیشتوون. ئەگەر بێت وسەرنجێکی ئەم مەسەلەیە بدەین بێ گوێ دان بەم زاراوە بەربلاوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جیاکردنەوەیە ـ واتا هێرش بردن و بەرگری کردن ـ بەهیچ جۆرێك لەگەڵ جیهادی ئیسلامیدا ناگونجێ، لەراستیدا جیهادی ئیسلامی هێرش و بەرگرییە لە هەمان کاتدا، هێرش بردنە چونکە کۆمەڵەی ئیسلامی بەربەرەکانێ ی ئەو دەوڵەتانە دەکات کە لەسەر بنچینەی جیا جیا و دژ بەئیسلام دامەزراون ، دەیەوێت لەرەگەوە دەریان بهێنێت، کە چی لە هەمان کاتدا بەرگری کردن (خۆپاراستن)ە چونکە ناچارە بۆ دامەزراندنی بناغەی دەوڵەتەکەی و داسەپاندنی کۆڵەکەکانی بەرگری لەخۆی بکات ، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانێ بەگوێرەی ئەو پلانە نەخشە کێشراوەی خۆی هەیەتی ئیش بکات، بێ گومان هەروەکو دەزانیت ئیسلامیش حزب و کۆمەڵە (Party) جا لەبەر ئەمە بە شوێنێکی دیارکراو و بەسنوورێکی جوگرافی نەبەستراوەتەوە، تاکو پاسەوانی بکا و پارێزگاری لێ بکا، بەڵکو لەراستیدا چەند بنەما و بنچینەیەك هەیە کە ئەم کۆمەڵە پارێزگاری لێ دەکا ولەپێناویا گیان

بەخت دەکا، هەروەها شالاو ناباتــە ســەر" بنکــەی " ئــەو کۆمەڵــەی کــە جیاوازە لەگەڵیدا و دژیەتی، بەڵکو شالاو دەباتە سەر ئەو بنچینانــەی کــە ئەم کۆمەڵەی لەسەر راوەستاوە. دەبێت ئەوەت لە بیر نەچێ کە ئیسلام لەم شالاوبردنەدا مەبەســتی ئــەوە نییــە کــە ئەوانــەی لەگــەڵیدا جیــاوازن لــە بیرۆکەدا ، وایان لێ بکات بەزۆری واز لە بیروباوەڕی خۆیان بهێنن و بــاوەڕ بە بنچینەکانی ئیسلام بکەن، بەڵکو خواستی کۆمەڵەی ئیسلامی ئەوەیــە: جڵەوی کاروبار لەدەست ئەوانەی کە باوەڕیان بە بنچینــە و ڕژێمــی نــاڕەوا هەیە دەربهێنێت، تاکو ئەرکی سەرشانی هەڵگرانی ئالای هەق سووک بێــت و ناکۆکی" فتنە " دروست نەبێ و ئایین و حوکم هەر بۆ خوای گەورە بێت.

## مافەکانی خەڵکی لە ئەستۆ[°]

لێرەدا گرێیەکی تر دەکەینەوە، کــە ماوەیــەکی زۆر بــوو خــەڵك نــەیان دەتوانی چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە، بۆیە تووشی گێروگرفتی کردبوون جــا لــەم باسەی پێشوو کەتێپــەڕی دەربــارەی خاســیەتەکانی جیــهادی ئیســلامی و ئاشکرا کردنی روخسارە جوانەکــەی و ئــەو مافانــەی کــە لــەچوار چێــوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا هەن بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە بنچینەکانی نییــە بەڵکو جگــە لــەو دان بەبنچینــەی تــردا دەنێــن، ڕوون دەبێتــەوە جیــهادی ئیسلامی دەست لە فیکرە و ڕێ وشون و کار و بــاری کۆمەڵایــەتی خــەڵك نادات کە بۆخۆیان هەڵیان بژاردبێت و بەباشیان زانیبێ لەبەر ئەوەی خــەڵك سەربەخۆن بۆ دان نان بەهەر بیروباوەڕێك، سەربەخۆییەکی تــەواویان هەیــە

---

°- حقوق أهل الذمة

لەهەڵبژاردنی هەر پـەیڕەوێك کـە بەباشـی بزانـن، بـەڵام لەهـەمان کـاتدا ئیسـلام رازی نـابێ بـەوەی سـەربەخۆبن لــە هەڵســووڕاندنی کاروبــاری فەرمانڕەوایی بە پەیڕەوێك کە لەلایەن خواوە نەهاتبێتە خوارەوە، هــەروەها لێ ناگەڕێت مافی هەڵسوڕاندنی پەیمان بەستن و مامەڵە و هەڵس وکەوتیان هەبێت بەو ڕێگایانەی کە هەڵەو خراپن و دەبنــە بـەڵا بەسـەر کۆمــەڵگا و دەبنە هۆی تێکدانی ژیانی ئاوەدانی، هەرچەندە ئـەوان لەپێشـوودا لەسـەر ئەوە راهاتبن، بۆ نموونە وەك سود خواردن "الربا".

جا هەر کاتێك ئیسلام هاتە سەر حوکم و جڵەوی کاروباری گرتە دەستی خۆی یەکسەر فەرمان دەدات بە لەناوبردنی و ڕیشەکێش کردن و داخسـتنی هەر دەرگایەك کە مەترسی پەیدابوونی سودخواردنی لێ دەکرێت، هــەروەها ڕێ نادات بـەیاری کردنـی کاغـەز " القمـار" بەهـەموو جۆرەکانییـەوە و ڕێگەش نـادات خـەڵك مامەڵـەو پەیمانبەسـتن بـەڕێگای گـەندەڵ و خـراپ ببەنەسەر کە شەرع قەدەغەی کردبێ، جا شوێنی داوین پیسی و تیاترۆخانە هەرمەڵێ!! چونکە فەرمانڕەوایی ئیسلامی پێش هـەموو کـارە ناپەسـەندو پیس و فەوتێنەرە کۆمەڵایەتییەکان ئەمە لەناو دەبات! بەم شێوەیە ئافرەتە ناموسڵمانەکان ناچاردەکرێن خۆیان بە ئادابی حەیاو سەرپۆش ببەستنەوە و قەدەغە دەکرێن لەڕووتی و نـەزانی و نـەفامێتی و ناچـاردەکرێن خـۆ بـەو سنووورە پێویستانە بگرن کەشەرع بڕیاری لەسەرداوە بــۆ داپۆشـینی لەشـی ئافرەتان. هەروەها چـاودێری سـینەما و یاریگاکـان دەکـات و لەپیسـی و ڕووتی وگوناه کـردن پاکیـان دەکاتـەوە و بـەرەو چـاکـەو ڕێگـەی راسـت ئاراستەیان دەکات. ئەمانە و هەموو جۆرە ڕێ و شوێنە کۆمەڵایەتییەکانی تریش کە هەن وەك لەمانە دەوڵەتی ئیسلامی ڕێیان پێ نـادات، ئەمـــەش بـۆ پاراسـتنی کۆمـەڵگای ئـادەمی و بـەختیارکردنی و ڕاگرتنـی و ڕێـــز

وکەرامـەتی و پاراســـتنی خاسـیەت و بنەماکانییـەتی، هــەروەها ڕێ بەدانیشتوانی نامـوسڵمان نادات بەپێ ی ئەو ڕێبــازە و نەریتانـە بـڕۆن کـە ئیسلام بە مەترسی دەزانێ لەسەر کۆمەڵگاو بە سەرچاوەی خراپەو فەسادی دەزانێ بۆ مرۆڤایەتی هەرچەندە لـەڕێبازەکانیاندا ڕێ ی ئـەم شـتانەیان لێ نەگیرا بووبێت و بەبێ دوودڵی ئەو شـتانەیان بـەگوێرەی خـوو و نـەریتیان ئـەنجام دابـێ. لەسـەرەتادا وادەردەکـەوێت کـە ئیسـلام لـەم مەیدانــــەدا لەسـنووری لێ بـوردن تـێ پـەڕیوە و ڕێگـای چەوسـانەوە و تـــەنگ پــێ هەڵچنینی گرتووەتە بەر. جا چاکتر وایــە بـۆ ئـەم جـۆرە کەسـانە " واتـە ئەوانەی بەم جۆرە لێکی دەدەنەوە " بــەراوردێك بکـەن تـاکو بزانـن چـۆن ئیسلام بەلێ بوردن جووڵاوەتەوە، کەچی لەهەمان کاتدا چۆن ئـەو ڕێچکـە شۆڕشگێر و چاکە خوازیانــەی تـر بەرانبــەر بەوانـەی جیـاوازن لەگـەڵیاندا جووڵاونەتەوە؟، جا ئەم جۆرە بەراوردکاریە بەئاشکرا ئەو جیاوازییــەیان بـۆ دەردەخات کەلـەنێوان ئیسـلام و ڕێبـاز و تیۆرەکـانی تـردا هەیـە، بۆیـان دەردەکەوێت کە ڕێچکە شۆڕشگێر و کۆمەڵایەتیەکانی تری جگە لەئیسـلام لەتەنگ هەڵچنینی فکرە و بۆ چوون گەیشـتوونەتە ڕاددەیـەك کـە مـرۆڤ بەهیچ جۆرێك خۆی پێ ناگیرێت و هەتا وای لێ هاتووە خەڵك لەترسی ئـەم ڕێبازانە هیچ دەرفەتێك بۆ خۆیان نەبیننەوە جگە لەراکردن نەبێت لە وڵات و دەربەدەری و ئاوارەبوون لەسەر رووی زەمیندا، کـەچی ئیسـلام بەرانبـەر بەم هەموو جووڵانەوە ناشرینانە ئاسایش و حەسـانەوە بـۆ هـەموو تـاکێك لەکۆمـەڵگای مرۆڤایەتی دابین دەکات، جا ئەو کەسە هـەر کـێ یـەك بـێ، وچانی پەرەسەندن و گەشانەوەیان لە هەموو ڕوویەکی ژیانــەوە بـۆ ئامـادە دەکات و بەجوانترین شێوە لەگەڵیاندا دەجولێتەوە بەجۆرێك کەهیچ هاوتای نابێ لەم جیهانەدا.

## نەداگیر کردن ونەڕووتاندنەوەیە.

ئـەوەی لـێرەدا پێویسـتە بـە بیرتـانی بهێنمـەوە ئەوەیـە کـە بـەپێ ی تێڕوانینی ئیسلام دەبێت جیهاد تەنها " لەڕێ ی خوادا " بێت و لـەپێناوی ڕەزامەندی ئەو بێت وبەس. موسڵمانەکانیش ئەگەر هاتوو خوا نیعمــەت و چاکـەی سـەرکەوتن و فـەتح کردنـی پـێ بەخشـین لەپاداشــتی جیـهادو غەزاکردنیان، نابێ لەسەر ڕێ و شــوێنی پاشـا و فـەرمانڕەوا سـتەمکار و زۆردارەکان بڕۆن.، . چونکە موسڵمان شەڕ ناکات و بـۆی نییـە شـەڕ بکـا کاتێ کە موسڵمانە بۆئەوەی تەختی کیسرای دەست کەوێ و وڵات و بـەندە بۆ ئارەزووەکانی خۆی ژێردەستکات ، جڵەو بۆ نەفسی خۆی شـۆڕبکاتەوە و لەداهاتی دنیادا ڕابوێرێت و خۆی نقووم بکا لەهەوا و ئارەزوەکانی خـۆی ، وەکو ستەمکارو زۆردارەکان، ئەوانەی خێروبێری زەوی دەخەنە ژێر دەســتی خۆیان و بۆ مەبەستی خۆیانی بەکاردێنن و بـەس. بـەندە بـێ دەسـەڵات و چەوساوەکانی خوا دەکەنـە پـەیژەی هـەواو ئـارەزووی خۆیـان ... نـەخێر هەرگیز ئەمە جیهاد نییە لەڕێ ی خوادا، بەڵکو ئەمە شەڕکردنە لەپێناوی تـاغووت ... ئیسـلامیش هەمیشـە لـەم جـۆرە جیـهادە و ئــەم جـۆرە فەرمانڕەواییە نابووتانە دوور و بێ بەشە. بەڵکو جیهادی ئیســلامی زیـاتر وا لەموسڵمانەکان دەکات تــاکو ئـارام بگـرن لەسـەر هـەموو ناخۆشـی و دژواریەکی ژیان و دووربن لە ڕابواردنی دونیــا و فریودەرەکـانی، سـەرەڕای ئەمەش داوای خۆڕاگرتنیان لێ دەکات لەبەرانبەر هەر ناخۆشــی و مـاندوو بونێك کەدێتە ڕێیان، لەسەر بەخشینی گیــان و نایابـترین شـت کەهەیانـە ڕایان دەهێنێ ، وانەی وازهێنان لەهەموو چاو برسـێتی و ئارەزوویـەك لـە پێناوی خوادا فێری شوێن کەوتوانی دەکات.

جا ئەگەر هاتوو خوای گەورە نیعمــەتی فـەتح کردنـی بـە موسـڵمانان بەخشی و بەپشتیوانی خۆی سـەری خسـتن و جڵـەوی کـار وباریـان کەوتـە دەست وخەڵکیان بۆ مـل کـەچ بـوو، لـەم حاڵەتـەدا ئـەو کەسـەی لـەناو موسڵمانە راست گۆ و ڕاستەقینەکان بەئەرکی فەرمانڕەوایی هـەڵ دەستێ هەر مەپرسە چـۆن هەسـت بـەگرانی لێ پرسـراوی و ناخۆشـی ئەرکـەکانی سەرشانی دەکات، لەوانەیە چەند مـانگ و هەفتـەی بەسـەردا تـێ پـەڕێ نەبەڕۆژ بحەسێتەوە و نە بە شەویش خەو بچێتە چاوی، لەبەر غـەم خـواردن لەبەرژەوەندی خەڵك و هاونیشتمانییان و سەر لێدان لـەحاڵی پەککەوتـە و بێ دەسەڵاتان! سەرباری ئەوەش فـەرماندەی موسـڵمانان هـەرگیز نـاتوانێ لەپەنای لووت بەرزی و پاشایەتی و کەش و فشی میرنشـینیدا لـەناو ئـەو شتە بەتام و چێژانەی کە لـەژیاندا هـەن رابویـرێ و خـۆی تـێر بکـات لـە پاداشتی ئەو ماندوو بوون و ئەرکـەی کەبەخشـی بـووی بـۆ چـاك کردنـی کاروباری دەوڵەت و چاودێری کردنی رژێمی فەرمانڕەوایی بەهەموو لایەنـە جۆر بە جۆرەکانیانەوە! ئەگەر چی لە دونیادا کـەس بـۆ کـارگێڕان و هـەڵ سوڕاندنی فەرمانڕەوایی راناکات، مەگەر تـەنیا بـۆ دەسـت کـەوتنی ئـەو کەش و فشە و ئەو رابواردن و بەزمەی ژیان نەبێت.

ئەوەی کاروباری موسڵمانان دەگرێتـە دەسـت لەگەڵەکـەی خـۆی زیـاتر نییە! تەنیا بە لەخواترسان نەبێت و هیچ دەسەڵاتیشـی بەسـەریاندا نییـە، تەنیافەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا نەبێت (ﷺ)، جـابۆی نییـە بچێتـە سەر تەختی گەورەیی بۆ ئەوەی لووت بەرزی و گـەورەیی و شـوێن و پایـە بڵندی خۆی پیشان بدا، بۆی نییە خەڵك بۆ خۆی مل کەچ بکـاو وایـان لێ بکات دان بەزەبر و زەنگی ئەودا بنێن.

هەروەها ڕێگای پێ نادرێت هەنگاوێك هەڵنێت لەهەر ڕێگایەك كە جیا بێت لەو ڕێگایەی شەریعەتی ئیسلامی ڕوونی كردۆتەوە، یاخود ناتوانێت بەردێك لەجێگای خۆی بجووڵێنێتەوە ئەگەر لە كتێبی خوا و فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) پاڵپشتی نەبێت، ناتوانێ نەخۆی و نەكەس لەخزم و دۆستەكانی خۆی ببورێ لەهەقی یەكێكی تر كەپێویست بێت لەسەریان بیدەنەوە، هەرچەندە ئەو كەسە دەست كورت و هەژار بێت لە كۆمەڵدا، هەروەها ناتوانێ دەنكە گەنمێك چیە وەری بگرێت یا بستە زەویەك بكاتە موڵكی خۆی، بێ ئەوەی مافی خۆی تێدا بێت. لێ ی حەرامە لەماڵی موسڵمانان شتێك زیاتر وەربگرێت لەوەی گوزەرانی پیاوێكی مام ناوەندی لەخەڵك لەسەری دەوەستێت، جائەو هەژارە ـ چەند جوانە پێ ی بڵێن هەژار! ئایا كێ هەیە لەمە شایستەتربێت بۆ بەزەیی پێداهاتنەوە و نزیك تر بێت لە هەژاری ـ؟ لەوەی بە هەڵسووڕاندنی كاروباری موسڵمانان هەڵدەستێ، كەچی خۆی بەم كۆت و پێ بەندانە بەستراوەتەوە و بۆی نییە خانووی بەرز بۆ خۆی سازبكات یاخود گوزەرانی خۆی خۆش بكات و بەشی خۆی لەبەهەشتی پڕ ئاسوودەیی ژیانی دونیا وەربگرێت.

بۆی نییە لەهیچ ساتێكا ئەركەكانی سەر شانی خۆی لەبیر بچێتەوە و لێ ی غافڵ بێت هەتاكو چركەیەكیش بێت چونكە ڕۆژێكی لە پێشە كە لەبەردەم خوای گەورە ئامادە دەبێ و لەسەر كردەوەكانی لێ پرسینەوەیەكی سەختی لەگەڵدا دەكرێ.

ئەم هەست كردنە بەلێ پرسینەوە و ترسە خوایی یە جڵەوی هەواو ئارەزووی دەگرێت و چاودێری هاتن و چوونی دەكات و كارگێڕی موسڵمانان باش دەزانێ و باوەڕی بەوە هەیە كە ڕۆژێك دادێ لە بەردەم خوای گەورە

رادەگیریٚ و لەسەر کردەوەکانی " گەورە بیٚت یان بچووك بیٚت، زۆربیٚ یان کەم" پرسیاری لیٚ دەکریٚت. جا هەروەك من لەجیٚ ی ئەودا بم دەلٚی: من دەبیٚ لەو رۆژە سەختە چی بکەم؟ ئەگەر هاتوو ئەمرۆ لەگەلٚ راسپاردەیەك ناپاکی بکەم، یا هەنگاویٚ لەزەوی بۆ خۆم دابرِم؟ یالووت بەرزی لیٚ بدەم بەناهەق لەسەر رووی زەوی و نیشانەی ستەم و زۆرداریم لیٚ دەربکەویٚت؟ یاخۆپەرستی تیٚکەلٚ بەکردەوەکانم بیٚت! یا لەهەرکاریٚکما دوای هەوا و ئارەزووی خۆم بکەوم!... بیر لەم هەموو شتانە دەکاتەوە و بۆیە خۆی بەربەست دەکات و لەترسی خوا لەم هەمووشتانە دوور دەکەویٚتەوە. سویٚند دەخۆم بەهەق " کەناوی خوایە" ئەوەی چاودەبرِیٚتە دونیا و هۆیەکانی رەخساندنی خۆش گوزەرانی و چیٚژ کردن لەو شتانەی کە تیٚیدایە، هەرگیز ناویٚریٚت دەست بداتە کاروباری موسلٚمانان، ئەگەر بینیت یەکیٚك دەویٚریٚ ئەمە بکات و لەهەمان کاتدا تەماعی دونیا و کەش و فشی ژیانی ئیٚستا بەرچاوی گرتووە ناتوانیٚ لیٚ ی رزگار بیٚت!.

بیٚ گومان بزانە ئەم کەسە بیٚمیٚشکە و نازانیٚ بۆکویٚ دەچیٚ و بەتەمای چیە، چونکە هەر یەکیٚك لە کۆمەلٚەی موسلٚمانان ئەو رۆزییەی بەدەستی دیٚنیٚ بە هۆی پیشەگەری بیٚت یا بازرگانی هەرچەندە کەم بیٚت ئەوا حالٚی باشترە و ژیانی خۆشترە لە گەورەی موسلٚمانان " ولی أمر". چونکە ئەو کەسە بە رۆژ ئیش دەکات و ئەوەی بەدەستی دەکەویٚ زیاترە لە و مووچەیەی کە لەمالٚی میریدا "بیت المال" دەدریٚ بە خەلیفەی موسلٚمانان! بەدریٚژایی شەویش تیٚرخەو دەبیٚ، هیچ شتیٚکیش نی یە لە خەوی بکات، کەچی خەلیفەی هەژار هیچ هۆیەکی گوزەرانی ژیانی بەدەست ناکەویٚت، وەك ئەوەی بەدەست بازرگانیٚ یا کریٚکاریٚ دەکەویٚت. وچانی ئەوەشی نییە وەکو زۆربەی خەلٚکی تر تیٚر بخەویٚت، ئەمە جیاوازییەکی

بنەڕەتی یا سەرەکییە لە نێوان فەرمانڕەوای ئیسلامی و فەرمانڕەواییەکانی تر، چونکە چینی کاربەدەست لــە فــەرمانڕەوا نائیسـلامییەکاندا، بەتــەنیا خــۆی دەســت دەگرێتــە دەرامــەت و دارایــی و بــەر و بوومــی زەوی ، بــۆ ئارەزووی خۆی هەڵی دەسوڕێنێ ، خۆی دەخاتە تەختی خوایــەتی لــە ســەر زەویی خوادا، کەچی فەرمانڕەوای ئیسلامی بە پێچەوانەی ئەم فــەرمانڕەوا زۆردارانە چینی کاربەدەست تێیدا هیچ ئامانجێکی نییە، تەنیا چاکە کــردن بۆ هاووڵاتیان و بەختیار کردنیان نەبێ، بەبێ جیاوازی لــە نێــوان گشــتی و تایبەتیدا، ئەو بەشەی کە خۆی وەری دەگرێت لە دارایی دەوڵەت وەکو هەر یەکێکی ترە لە ناو کۆمەڵدا، ئە گەر بێتوو بەراوردێ بکەین لە نێوان ئــەو مووچە و مانگانەیەی کە بە قازی و کاربەدەست و والی یــەکان دەدراو لــە نێوان ئەو مووچە زۆرانەی کە بەفەرمانبەرانی ئــەو فەرمانڕەواییانــەی کــە هاوچەرخی فەرمانڕەوای ئیسلامی بوون دەدرا، یــا ئــەو مووچــە زۆرانــەی فەرمانبەرەکانی فەرمانڕەواییە ئیمپریالیستەکان بەدەستیان دەکەوێت، ئەوا جیاوازیــەکی گیــانی و بنچینــەیی گــەورە لــە نێـــوان غـــەزا وفتوحاتـــە ئیسلامییەکان و لە نێوان چاو برسێتی و پیلانە ئیمپریالیزمیەکاندا هەیــە، جا بۆ نموونە والی ی هەرێمە گەورەکانی وەکو خوراسان و عــێراق و شــام و میسر ئەوەندەیان وەر نەدەگرت کــە مووچــە خۆرێکــی ئــەم ســەردەمە بــە دەستی دەکەوێت، بۆ نموونە یەکێکی وەکو أمیر المؤمنین ـ أبوبکر الصدیــق ـ یەکەم خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە کاروباری دەوڵەتێکی فراوانــی هەڵ دەسووڕاند، کەچی لە ماڵی دارایی میری مانگانەکەی لەســەد روپیــە زیــاتر نــەبوو، هــەر وەهــا عومــەری کــوڕی خــەتتاب بــۆ رۆژی خــۆی و خێزانەکەی مانگێ لە ســەدوپەنجا روپیــەی زیــاتر وەرنــەدەگرت ئەگــەرچی خەزێنەی دەوڵەت لە بەر پڕی لێ ی دەڕژا ،بە هۆی زۆریی ئەو دەرامەتــەی

که لە دەست کەوت و داهاتی زەوی و زار بۆی دەهات، ئەمیش بەهۆی ئەو فتوحاتە گەورانەی کە لە زەوی و زاری ولاتی رۆم و فارسدا دەکران. لەیەکەم جاردا وا دێتە پێش چاو کە ئیسلامیش وەکو داگیرکەران زەوی و زار داگیر دەکات و ولاتان بێزار و هەراسان دەکات، بەلام نەخێر جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا لە ناوەرۆك و بنچینە و ئامانجیشدا وەکوجیاوازی نێوان ئاسمان و ڕێسمان؟!

ئەمەیە حەقیقەت و راستی ی" جیهاد" کە ئەم بێگانانە دەهاتن و دەچوون بۆ شێواندنی و ناوبەد کردنی و دەست کاری کردنی مەبەستەکەی کە رەنگە زۆر جار گوێتان لیّ بووبیّ. جا ئەگەر بپرسن و بلێن کوانیّ ئەو ئیسلامەی کە تۆ لەمەو پێش خاسیەتەکانت روون کردەوە؟ کوانیّ ئەو کۆمەلگا ئیسلامییەی کە بەدرێژی لە بنەماکانی و ئەرکەکەی سەر شانی دوایت؟ لە کام شوێندا بۆ چوونی جیهادی راستەقینە کە تازە پەردەت لەسەر رووی لابرد نێژراوە؟ بۆ چی دەبینین ئەم ولاتە ئیسلامییانە خالّی یە لەم جۆرە فیکرە و بۆچوونە بەرزە؟ منیش لە وەلامدا دەلێم: ئەمە گوناهی ئێمە نییە و ئێمەش لێپرسراونین لەم مەسەلەیەدا، بەلکو گوناهی ئەو کەسانەیە کە موسلمانەکانیان لەرێ ی راست و ئامانجە راستەقینەکەی خۆیان لاداوە، بەنوشتەو کشتەك و تەزبیح بادان و دەروێشی خەریکیان کردبوون و بەشتی نارەوا و پڕو پووچ بەتەمایان کردبوون و بەلێنی رێگەی ئاسانیان پێدابوون کە لە بارگرانی جیهاد و ماندووبوونی خەبات کردن بیان حەسێنێتەوە و وایان لێکردبوون کە روو بکەنە گورستان و گۆشە و سووچەکان و پەنایان ببەنە بەر تاکو ئەو "گۆڕ" انە و ئەوانەی کە تێیدا حەشاردراون بکەنە وەسیلە بۆ گەیشتن بەئامانجی چاوەڕوان کراوی خۆیان ، کە ئەویش بەختیار بوونی هەتا هەتاییە. ئەم گوناهەش دەکەوێتە ئەستۆی

ئەوانەی لایان دابوون لە بنەماکانی ئیسلام و بنچینــە تــەواو و گشــتیەکان وخەریکیان کردبوون بەمەسەلە ناسەرەکی " فرعی " یەکانی " فقــە" کە نەبرین سارێژدەکا و نەبرسیش تێردەکات، کە هیچ سوودێکی وای نەبوو بــۆ چارەسەرکردن و شــی کردنــەوەی بنــەماکانی ئیســلام، تــاوای لــێ هــات موسڵمانەکان ئەو مەبەستەیان لە بیر بچێتــەوە کــە لــە پێنــاویدا دروســت کراون و لەو ئامانجە بەرزانەی کە ئیسلام داوایان لێ دەکــات غــافڵ بــن و بەتەواوی لە بیر خۆیانی ببەنەوە. جا ئەگەر ویستت زیاتر لەو هۆیانە بزانی کە بووەتــە هــۆی هاتنەوەیــەکی ســێبەری ئیســلام و کزبوونــی دەســەڵاتی کۆمەڵەی ئیسلامی ئیمڕۆ، پێویستە چــاوێك بــەو ســەرکردەو و پێشــڕەو و فەرمانڕەوایانەدا بگری، کەوا پیشــان دەدەن باوەڕیــان بــەکتێبی خــواو بــە پەیڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە بەڵام ئەوەی جــێ ی داخــە ئەوەیــە ئــەوان وادەزانن ئــەرکی سەرشــانی خۆیــان بەرانبــەر قورئــان و ئــەو شــەریعەتەی پێغەمبەری مــەزن پــێ ی نــێرراوە، تــەنیا ئەوەندەیــە کەبەشــداری بکــەن لەئاهەنگی رۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە جــارێك، جــارێکی تریش چەند قورئان خوێنێك بانگ بکەن بۆ ئــەوەی خــەتمێك یــا دووخەتمــە لەماڵیاندا بخوێنن و پێشکەشی گیانی پاکی خزمــە مردووەکانیــان بکــەن، خۆ ئەگەر هاتوو کەمێك چاکە و پیــاوەتی بکــەن، ئــەوا چــەند خوتبەیــەك دەدەن لەشانازیی کردن بەئیسلام و ستایش کردنی فەرمایشــتەکانی، هــەر وەکو چۆن ئێستا خەڵك ستایشی شاعیرەکان دەکــەن و بەخۆڕایــی و بــەبێ هۆ مەدحیان دەکەن و پێیاندا هــەڵ دەڵێــن کــەچی ئیــش پــێ کــردن بــەم شەریعەتە و تێکۆشان بەدوای جێ بەجێ کردنی لە جیهاندا ئــەوان ئــەوەیان هەر بەخەیاڵدا نایەت، بەڵکو واتێدەگەن کــە خــوای گــەورە "تکلیــف" ی هیچی لێ نەکردوون، خۆشیان لەبنەڕەتدا ئامادەنین بۆ خۆ بەند کــردن بــەم

سنوورانه و هەڵگرتنی بارگرانی ی ئەم بەرپرسیاریانەی کە خـوا بـەندەکانی پێ ڕاسپاردووە و ئیسلامیش کردوویەتی بەئەرکی سەرشـانی ئەوانـەی کـە باوەڕی پێ دێنن و داوای شوێن کەوتنی بۆ دەکەن. چونکە ئەو سەرکردەو و لێپرسراوانە ئاواتە خوازی ژیانێکی ئاسوودە و بەهیوای ڕێگایەکی ئاسانن بۆ ڕزگار بوون.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين
وصلى الله على محمد وعلى آله وصـحبـه أجـمـعـين

شەوی ١٩٨٢/١٢/٢١.

بسم اله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد سيد المجاهدين وإمام المتقين وقائد الغر المحجلين وعلى آله وصحبه ومن جاهد في سبيل شريعته الى يوم الدين-:

خواى گەورە زۆر بەتوندى جيهادى لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرز كردووە بەجۆرێك كە جێگاى بيانوو بەڵگەهێنانەوە و خۆ لىَ دەرباز كردن و خۆ دزينەوەى تێدا نەهێشتووە، هەروەها لەپێش چاوى موسڵمانەكانى شيرين كردووە و پاداشتى گەورەى بۆ موجاهيدان و شەهيدان داناوە، بەجۆرێك كەپلەى كەسى وا بەرز نەكردۆتەوە مەگەر تەنيا ئەوەى كردەوەى ئەوانى هەبووبىَ و لە جيهاد كردن لەسەر رێگاى ئەوان رۆيشتبىَ جا بۆيە دەبينين زۆر زێدەماف(إمتيازات) ى پێداون، زێدەمافى گيانى و كردەوەيى وا كەبەكەسى ترى نەداوە، لەبەر ئەوە خوێنى پاكيانى كردووە بە پێشەكى لەدونيا و نيشانەى سەركەوتن و بەخشين لەرۆژى دواييدا، ئەوانەش كە دادەنيشن و خۆيان دەخەنە دواوە بەناخۆشترين سزا ترساندوونى و بەناشيرينترين شێوە ناوى بردوون.

لەبەر ئەو دانيشتن و ترسنۆكييەيان شكاندوونى و شەرمەزارى كردوون و ئەو كزى و دواكەوتنەى ئەوانى ئاشكراكردووە و دايناوە كە ئەوان ئەو كزى و سەرشۆڕييەيان لەسەرلاناچىَ تاكو نەگەڕێنەوە و دەست نەكەن بە جيهاد كردن، ئا ئەمە لە دنيادا بەڵام لە رۆژى دواييدا ئازارو سزايەكى واى بۆ داناون كەلىَ ى رزگار نابن ئەگەر هاتوو بەئەندازەى چياى (أُحد) زێڕيان هەبێت .

لەبەر ئەوە دانیشتن و ڕاکردن لە جیهاد دا بەیەکێك لەگوناهە گەورەکان (الکبائر) دادەنرێت ، بەیەکێك لەو حەوت فەوتێنەرەکان (الموبقات)ی داناوە. جابێگومان نابینی هیچ رژێمێك (کۆن یان نوێ) ئاینی یاشارستانی هەبێت کە بەم شێوەیە بایەخ و گرنگی دابێ بە جیهاد کردن و سەربازێتی و کۆکردنەوەی تاقم و چینەکانی گەل و یەك کردنیان لە ریزێکدا بۆ پارێزگاری کردن لەهەق بە هەموو تواناو هێزێکەوە، وەك ئەوەی لە ئاینی ئیسلام و فەرمایشت (أحادیث) و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دەبینی . هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پڕە لەم جۆرە مانا و مەبەستە پیرۆزانە، کە بەباشترین دەربڕین و ڕوونترین شێواز داوای جیهاد کردن و شەڕ کردن وسەربازێتی و بەهێزکردنی هۆیەکانی پاراستن و خەبات کردن دەکات، بەهەموو جۆرەکانییەوە، لە ئاوی و دەریایی و لەهەموو بارو ڕووداو و دۆخێکدا، لێرەدا چەند نموونەیەك لەم ئایەت وفەرموودانەت بۆ دەست نیشان دەکەین ئەمەش تەنیا بۆ سەرنج ڕاکێشانە نەك بۆ باس کردنیەتی بە درێژی، ئێمە هیچ کام لەم ئایەت و فەرموودانەت بۆ لێك نادەینەوە و باس ناکەین[٦] چونکە تۆ لەهێزی ووشەکانی و ڕوونی ماناکەی و پاکی بەیانەکەی و تینی گیانەکەی ئەم واتایانە دەبینی کە ئەمانەی تری پێویست نییە .

---

[٦] – سەرنج:

لەبەرئەوەی ئەم کتێبە خۆی لە بنەڕەتدا بەعەرەبی نووسراوە بۆیە ئایەت و فەرموودەکانی لێك نەدراوەتەوە، جا ئێمە لێرەدا بە پێویستی دەزانین کە بەکورتی لێکی بدەینەوە و لەنێوان دووکەوانەی دابنێین) وەرگێڕ.

## هەندێك لە ئایەتەكانی جیهاد لە قورئاندا؟

١-﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ القِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ.﴾ (البقرة:٢١٦).

(كُتِبَ) بەمانای (فُرِضَ) واتە پێویست كراوە، هەر وەكو دەفەرمووێ ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ.﴾ لەهەمان سوورەتدا و بەهەمان عیبارەت و دەربڕین. واتە: (شەڕكردنتان لەسەر پێویست كراوە هەرچەندە پێتان ناخۆشە و لاتان گرانە و بەدڵتان نییە، بەڵام لەوانەیە ئێوە شتێكتان لا ناخۆش بێت كەچی قازانجی ئێوەی تێدابێت، یاخود ئێوە شتێكتان لا خۆش بێت كەچی زیان و خراپەی بۆ ئێوە هەبێت، جا خوا باشتر دەزانێ و ئێوە نازانن).

٢- ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُواْ لاَ تَكُونُواْ كَالَّذِيْنَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى الأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَوْ كَانُواْ عِنْدَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ اللهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ وَاللهُ يُحْيِ وَيُمِيْتُ وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيْرٌ، وَلَئِنْ مُتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلِى اللهِ تُحْشَرُونَ.﴾ (آل عمران:١٥٦-١٥٨) .

(ضربوا في الأض: خرجوا فيها مجاهدين) واتە: تێیدا دەرچوون بۆ جیهاد كردن (غُزًّى: غزاة محاربين) غەزاكەر وشەڕكەر بوون.

واتە: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، وەكو ئەو كافرانە یان دووڕووانە مەبن. ئەوانەی كاتێ برا و كەس و كاریان بۆ رۆزی پەیداكردن یاخود بۆ شەڕ كردن دەچوون ، دەیان گوت: ئەگەر ئەو براو كەس و كارانەمان لە نێوانماندا بونایە ئەوا نەدەمردن و نەدەكوژران، خوای گەورە دەیەوێت بەو قسەیەی خۆیان غەمیان بداتێ چونكە هەرخوا خەڵك زیندوو

دەکاتەوە و هـەر خۆشی دەیـانمرێنێ، خـوا هـەموو شتێکیش دەبینـێ و ئاگادارە ، ئەگەر لە رێ ی خوادا کوژران یـان مـردن، ئـەوا لێخۆشـبوون و بەزەیی خوا بۆ ئێوە چاکترە لەو ماڵی دنیایەی کە ئـەوان کـۆی دەکەنـەوە، ئەگەر مردن یاخود کوژران ئەوا بۆلای خوا دەگەڕێنەوە و ئەویش پاداشـتان دەداتەوە).

جا سەرنج لە بەراوردکردنی لێخۆشبوون و بەزەیی پێداهاتنـەوە و رەحـم کردن بدە لەکاتی کوژران یـا مـردن لـەرێ ی خـوادا لـە ئایـەتی یەکـەم و نەبوونی لەئایەتی دووەمدا لەبەر نەبوونی مانای جیهاد تێیدا.

لەم ئایەتەدا ئەوە دەست نیشان دەکرێت کە ترسنۆکی رەوشتی کافرانە نەك موسڵمانان، جا بڕوانە چۆن ئێستا ئەم شتە پێچەوانە بووەتەوە؟

٣- ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِيْنَ قُتِلُواْ فِى سَبِيْلِ اللهِ أمْوَاتاً بَلْ أحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّـهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِما آتَاهُمُ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ وَ يَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَـمْ يَلْحَقُـواْ بِـهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ ألاَّ خَوفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ.﴾ (آل عمران:١٦٩-١٧ ).

جا سەرنجی ئایەتەکە بدە لە قورئانی پیرۆزدا.

واتـــە: (واتـــێ مەگـــەن ئەوانـــەی لـــە رێگـــای خـــوادا کـــوژراون (واتەشەهیدکراون) مردوون، نەخێر ئەمانە لەلای خـوادا زینـدوون ، خـوای گەورەش رزقیان دەداتێ، شادمان و دڵ خۆشن بەو چاکەیەی کەخوای گەورە لەگەڵی کردوون. مژدەش بەوانە دەدەن کەلەدوایی ئەوان دێن و هێشتا پـێ یان نەگەیشتوون، کەهیچ ترسیان لەسەر نییە و غەم ناخۆن) .

٤- ﴿فَلْيُقَاتِلْ فِى سَـبِيلِ اللهِ الَّذِيـنَ يَشْـرُونَ الْحَيَـاةَ الدُّنْيَـا بِـالآخِرَةِ وَمَـنْ يُقَاتِلْ فِى سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَلْ أوْ يَغْلِبْ فَسَوفَ نُؤْتِيهِ أجْرًا عَظِيمًـا.﴾ (النسـاء :٧٤. )

واتە: (با لەپێناوی خوادا شەر بکەن، ئەوانەی کەوا ژیانی دنیای خۆیان دەفرۆشن لە پێناوی ژیانی نەبڕاوەی رۆژی دوایی، هەرکەسێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاینی خوا شەڕبکات جا بەدەستی کافرەکان بکوژرێ، یاخود بەسەریاندا زاڵ ببێ ((جا چ بەکوشتنیان یا بریندار کردنیان، یا بە گرتنی چەك وکەرەسەی جەنگییان))، ئەوا ئێمە پاداشتێکی گەورەی دەدەینەوە).

سەرنجی ئایەتی ٧١ تا ٧٨ بدە لەقورئانی پیرۆز، تا بزانی چۆن خوای گەورە موسڵمانەکان هان دەدات بۆ ئاگادار بوونەوەو وریا بوونەوە و (حذر) وەرگرتن، وشەڕکردن لە شێوە سوپادا، یا لە شێوەی دەستە دەستە (عصابات)[٧] یا بەتەنیایی بەپێ ی پێویستی بارودۆخ.

جا چۆن رووی پاڵ دەرەوان و بێ غیرەتان و سوود پەرستان و دواکەوتوان دەشکێنێت و شەرمەزاریان دەکات، چۆن بۆ پارێزگاری لە بێ دەسەلاتان و رزگار کردنی زۆر لێکراوان هەستیان دەبزوێنێت. چۆن شەڕکردن و نوێژ و رۆژوو پێکەوە دەبەستێت، ئەوە روون دەکاتەوە کە شەڕکردنیش وەك ئەمان لە پایەکانی (أركان) ئیسلامە.

هەروەها چۆن پێچ و پەناو گومان کردنی دوودڵان بەتاڵ دەکاتەوە و ئازایەتی و بوێرییەکی زۆر دەخاتە دڵی ترسنۆکەکان، تاکو بتوانن بە روویەکی کراوە و دلێرانەوە بەرەنگاری مردن ببن، بۆیان روون دەکاتەوە کەمردن شتێکی حەتمی و ناچارییە، دەبێ هەموو کەس بینۆشێ، ئەگەر ئەوانیش لە رێگای جیهادا مردن ئەوا لەبەرامبەر ئەم ژیانە مەزنترین پاداشتیان پێ دەدرێتەوە، ئەومالّ بەخشینە و فیداکارییەی کە کردبوویان لە لای خوا هیچی بەفیڕۆ ناچێ، هەرچەندە کەمیش بێت.

---

[٧] -عصابات: پارتیزانی

٥- سورەتی (الأنفال) هەمووی هاندانە لەسەر شەڕکردن و مانــەوە و خۆ ڕاگرتن، بەدرێژی باسی زۆربەی یاســا و ئەحکامــەکانی دەکـات، بۆیــە موسڵمانەکان کردبوویانە سروودی جەنگ و هــەردەم لەســەر زاریــان بــوو و لەکاتی گەرمەی شەڕدا دەیان خوێندەوە، ئەوەندە بەسە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الخَيْـلِ تُرْهِبُـونَ بِـهِ عَـدُوَّ اللَّـهِ وَعَدُوَّكُمْ....﴾ تا دەفەرموێ ﴿يا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ المُؤْمِنِيَن عَلَى القِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِـاْئَتَيْنِ وَإِنْ يَكُـنْ مِنْكُـمْ مِائَـةٌ يَغْلِبُـواْ أَلْفًا مِنَ الّذِيْنَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ.﴾ (الأنفال:٦٠-٦٥).

یەکـەم، واتــە: (ئــەی موســڵمانەکان ئــەوەی لەدەســتتان دێــت (بۆتــان دەکرێت) لەبارەی هێزەوە وەك چەك و کەرەسەی جەنگ، شیر و تیرو ...تۆپ و تــەیارە و ...هتــد ئامــادەی بکــەن، هــەروەها ئەســپ و ئێســتر ،ە،تــاکو دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن) .

دووەم ، واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانان هان بــدە بــۆ جیــهاد کردن ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگرتان هەبێت ئــەوا بەســەر دووســەد کــەس لەدوژمندا زاڵ دەبن، ئەگەر سەد کەسی وا لە ئێــوە هــەبێت ئــەوا بەســەر هەزار کەس لە دوژمن زاڵ دەبن چونکە ئەوان میللەتێکن کافرن و تێناگەن و دڵیان پاك نییە) .

٦- هەروەها سورەتی (التوبة)ش هەمووی هاندانە لە سەر جیهاد کردن و روون کردنەوەی فەرمانەکانی، جا ئەوەندە بەس نییە لــەو شــوێنەی خــوا فــەرمانی شــەڕ کردنــی داوە لەگــەڵ ئــەو (مشــرك) انــەی کــە پـــەیمانیان شکاندووە؟

﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللهُ بِأَيْدِيْكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرُكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبَ اللهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ.﴾ (التوبة:١٤-١٥) .

واته: (شەڕ بکەن لەگەڵیان تاکو خوا بەدەستی ئێوە ئازاریان دەدات و سەرشۆڕیان دەکات و ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەکات و، دڵی ئەو ئیماندارانە خۆش دەکات، کەغەمیان خواردووە بەوەی کافرەکان دەرهەقی ئەوان کردوویانە و تاکو ئەو رق و قینەی کە هەیانە بەرانبەر بە کافرەکان لە دڵیاندا دەرکات و خوای گەورەش لەو کەسانە خۆش بێت کە خۆی دەیەوێت و خوا زاناو دانایە).

هەروەها لەباسی شەڕکردن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان (فەلەو جووە)کان ـ أهل الْكتاب ـ دا دەفەرمووێ: ﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلايُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللهُ وَ رَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الجِزيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ.﴾ (التوبة :٢٩).

واته: (شەڕ بکەن لەگەڵ ئەوانەی بڕوایان بە خوا و رۆژی دوایی نییە و ئەو شتەی کە خوا و پێغەمبەر حەرامیان کردووە ئەوان حەرامی ناکەن و بە قەدەغەی نازانن، ئاینی راستی کەئیسلامە ئەوان لێ ی دوورن و مل کەچ نین بۆی، لەوانەی کە کتێبیان بۆ هاتووە (واتە جوو و دیانەکان) هەتاکو ئەوانە (سەرانە) دەدەن کە لەتوانایاندا هەیە و دێنە ژێر ئالآی دەوڵەتی ئیسلامی و مل کەچ دەبن بۆی).

پاشان لە چەند ئایەتێکدا جاڕدانی گشتی رادەگەیەنێت کە پڕ بەدەم هاوار دەکات و هەمووشتێك دەلەرزێنێتەوە و لەکۆتاییدا دەفەرمووێت: ﴿إِنْفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ..﴾(التوبة:٤١) .

واتە: (بە پیر و گەنجەوە دەرپەڕن و بە هێزدار و بێ هێزتانەوە، بە دەوڵەمەند و هەژارەوە بۆ جیهادکردن، بەماڵ و نەفسی خۆتان جیهاد بکەن لە ڕێگای خوادا، ئەوە بۆئێوە باشترە گەر بزانن).

پاشان نارەزایی بەرامبەر بە هەڵوێستی دواکەوتوو و ترسنۆك وچەپەڵەکان دەردەبرێت و بۆهەتا هەتایە لە پاداشتی جیهاد کردن بێ بەشیان دەکات ، هەر وەکو دەفەرمووێ: ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللهِ وَقَالُوا لاتَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّاً لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونْ، فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيراً جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونْ، فَإِنْ رَجَعَكَ اللهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ..﴾. (التوبة :٨١-٨٣).

واتە: (ئەو کەسانەی کە خۆیان دواخست لەشەڕ لەگەڵ تۆدا ئەوانە دڵ خۆش بوون بەو ئیشەی کە کردیان و پێ یان ناخۆش بوو بەماڵ و نەفسی خۆیان جیهاد بکەن لەڕێگەی خوادا و دەیانگوت لە کاتی گەرمادا بۆ جیهاد مەچن، تۆش پێیان بڵی ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە ئەگەر بزانن و هۆش و مێشکتان هەبێت، جا با ئەوانە کەم پێبکەنن لەم دنیایەدا، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا دەبێ زۆر بگرین لە سزای ئەو شتانەی دەیانکرد، ئەگەر گەڕایتەوە هەندێك لەوان داوای ئەوەیان لێکردی کە ڕێگەیان بدەی تاکو لەگەڵتا دەربچن، تۆش پێیان بلێ هەرگیز لەگەڵ مندا دەرناچن و لەگەڵ مندا شەڕناکەن دژی هیچ دوژمنێك، چونکە ئێوە رازی بوون بە دانیشتن لەیەکەم جاردا، ئێستاش لەگەڵ دواکەوتوان بمێننەوە).

لەدواییدا شانازی کردنە بەهەڵوێستی موجاهیدەکان، لە سەرووی هەموویانەوە گەورەو پێشڕەویان محمد (ﷺ) هەروەها ڕوون کردنەوەی

ئەوەی کە جیهاد کردن ئەرکی پیرۆزێتی و ڕەفتار و رێ و رەوشتی هاوڕێ نازدارەکانیەتی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ جَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَأُولئِكَ لَهُمُ الخَيْرَاتُ وَأُولئِكَ هُمُ المُفْلِحُونَ، أَعَدَّ اللهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيْهَا ذَلِكَ الفَوْزُ العَظِيمُ.﴾ (التوبة : ٨٨-٨٩). واتە: (بەڵام پێغەمبەر و ئەوانەی بڕوایان پێ هێنابوو، بەماڵ و بەنەفسی خۆیان جیهادیان کرد،جا ئەوانە چاکە و بەخشیشیان بۆ هەیە و هەر ئەوان سەرکەوتوون، خوای گەورە بەهەشتی پێداون کە کانیاو و روباری تێدایە و هەتا هەتایە تێیدا دەژین، بەڕاستی ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە) . پاشان بەیعەتێکی تەواو و پتەوە کەهیچ بیانوو و بەڵگە لەدڵدا ناهێڵێتەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ اشْتَرَى مِنَ المُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِى سَبِيلِ اللهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيهِ حَقًّا فِى التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الفَوْزُ العَظِيمُ.﴾ (التوبة :١١١).

واتە: (خوای گەورە نەفس و ماڵی لە موسڵمانەکان (ئیماندارەکان) کڕیوە بەوەی بەهەشتیان پێبدات، کاتێ کەئەوانە لەپێناوی خوادا شەڕدەکەن، دوژمنەکان دەکوژن، یا دەکوژرێن، لەرێگای خوادا شەهید دەکرێن، ئەمەش بەڵێنە، کەخوا بەموسڵمانەکانیداوە لەتەورات و ئینجیل و قورئان، ئایا کەس هەیە لە خوای گەورە بەوەفاتربێ بۆ بەڵێن بەجێ گەیاندن؟ جا ئێوەش مژدە بدەن بەو بەڵێنەی کەپێتاندراوە، ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە و راستەقینە).

٧-سورەتی القتال- جابڕوانە چۆن لەکتێبی خوادا سورەتێك بەتەواوی ناونراوە بە سورەتی القتال- هەروەکو دەڵێن: بناغەی گیانی سەربازێتی

بریتییه له دوو شت: گوێ ڕایەڵی و ڕژێم (الطاعة والنظام)، خوای گەورەش ئەو بناغەی لەم دوو ئایەتەدا کۆکردووەتەوە، جالەبارەی گوێ ڕایــەڵی لــەم سورەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُواْ لَوْلا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ الأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ.﴾ . (القتال:٢٠).

واتە: (ئەوانەی بڕوایان هێناوە داوا لە خوا دەکەن کەسـورەتێك بنێرێتـە خوارەوە و تێیدا باسی جیهاد بکات، کـاتێك سـورەتێك دێتـە خـوارەوە و باسی جیهادی تیادا دەکرێـت دەبینـی ئەوانـەی دڵیـان نەخۆشـە ڕەنگیـان دەبزڕکێ و تێك دەچێ، وەك ئەوکەسەی لەسەرەمەرگابێت، جاباشتر وایە بۆ ئەوان گوێ ڕایەڵی بکەن و قسەی ڕاست بکەن، کـاتی ڕاسـتی واتـە کـاتێ شەڕ ڕوودەدات پیاوی ئازا و بوێر دەردەکەوێ، ئەگەر ئـەوان لەگـەڵ خـوادا ڕاست بکەن لەوەی دەیانگوت، ئەوە باشترە بۆیان).

بەڵام یەك خستنی ریزەکان، لەسـورەتی الصّـف دا هـاتووە، هـەروەك خوای گەورە دەفــەرموێت ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ.﴾. (الصّف:٤). واتە: (خوای گەورە ئـەو کەسـانەی خۆش دەوێــت کەلـەپێناوی خـوادا شـەڕدەکەن لـە ریزێکـدا کـە دەڵـێ ی دیوارێکە خشت لەدوای خشتە و هیچ کەلێنی نییە).

٨- ســورەتی (الفتــح)یـش هـەمووی دەربـارەی یـەکێك لەغـەزاکانی پێغەمبــەر (ﷺ) دەدوێ و شـانازی بەیـەکێك لەهەڵوێســـتە جیهادییــە پیرۆزەکانییەوە دەکات، کەلەژێر دارە پیرۆزەکە بەیعەتی مانەوە و مردن بــە پێغەمبەر درا، کەبەروبوومی (ثمرة) دڵ ئارامی و فـــەتح کردنـی تێـدا بـوو هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ

تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا وَمَغَانِمَ كَثِيْرَةً يَأْخُذُونَـهَا وَكَانَ اللهُ عَزِيْـزًا حَكِيْمًـا.﴾ (الفتـح :١٨). واتـه: (خواى گەورە لەو موسڵمانانە رازى بوو، كە بەيعەتيان لەگەڵ تۆدا بەستووە لەژێر دارەكە، دەزانێ دڵيـان پاكـە بـۆ ئيسـلام و جيـهادكردن ، بۆيـە دڵ ئارامى بەسەرا باراندوون و پاداشتێكى باشـى پێداون، بـەوەى كەبـەڵێنى فەتح كردنى پێ داون، هەروەها دەستكەوتێكى زۆر نزيـك، ئـەويش فـەتح كردنى شارى مەككەيە، خواى گەورە بەتواناو كارساز و دانايە).

ئەى براى شيرينم ئەمە هەندێك بوو لەو ئايەتانـەى كەباسـى جيـهاد و روونكردنەوەى فەزڵ و گرنگييەكەى تيێدا هاتووە، كـەهاندانى ئيمـانداران و مژدە پێدانى ئەوانەى جيهاد دەكەن بـە پاداشـتێكى زۆر جـوان و گـەورەى تێدا دەبينى، هـەروەها كتێبـى خـوا پـڕە لـەم جـۆرە و جـاتۆش سـەرنجى لاپەڕەكانى بدە و بـە ووردى بـيرى لـێ بكـەوە تـابزانى ئـەو شـتە سـەر سـوڕێنەرانە چـين كەتێيدايـە و ئەوكاتـە سەرسـام دەبـى لـەبێ ئاگـايى موسڵمانان لە بەجێ هێنانى ئەم خێرە (دەسكەوتە) مەزنەدا.

ئەمەش چەند فەرموودەيەكى پێغەمبەرە لەم بارەيەوە:

## چەند فەرموودەيەكى پێغەمبەر دەربارەى جيهاد

١) ئەبو هورەيـرە خـوا لىٚ ى رازى بێـت دەفـەرموێ: گوێـم لـێ بـوو پێغەمبـەر (ﷺ) دەيفـەرموو ((والّـذي نَفسـي بيـده لـولا أن رجـالا مـن المؤمنين لا تطيب أنفسهم أن يتخلّفـوا عـني ولاأجـد مـا أحملـهم عليـه مـا تخلّفت عن سريّة تغزو في سبيل الله، والّذي نفسي بيده لوددت أني أقتـل في سبيل الله ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل)) بوخارى و موسلم ريوايەتيان

کردووه. واته: (سوێند دەخۆم بەو کەسەی کەنەفسی منی بەدەستە، ئەگەر لەبەر هەندێ لەهاوەڵەکانم نەبێ، کەحەزناکەن لەمن دابڕێن و دواکەون، لەبەر ئەوەی من هیچی وام بەدەست نییە تاکو ئەوانی پێ سوار بکەم و لەگەڵمدا بێن، ئەوا لەهیچ پەلێکدا کەلە پێناوی خوادا غەزا دەکات دوانەدەکەوتم، سوێند دەخۆم بەوکەسەی کەنەفسی منی بەدەستە من حەزدەکەم لە پێناوی خوادا شەهید بکرێم و پاشان زیندو بکرێمەوە و دیسان شەهید بکرێم و پاشان زیندو بکرێمەوە و لەدواییدا شەهید بکرێمەوە).

٢) ئەبوو هورەیرە دەگێڕتەوە و دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((والّذي نفسي بيده لا يكلم أحد في سبيل الله والله اعلم من يكلم في سبيله إلا جاء يوم القيامة اللون لون الدم والرّيح ريح المسك)).

واتە: (سوێند دەخۆم بەوکەسەی کەنەفسی منی بەدەستە، هەرکەسێك لەرێگای خوادا بریندار بکرێت، خواش خۆی دەزانێ کێ لەرێگای ئەودا بریندار کراوە، ئەوا ئەوکەسە لەرۆژی قیامەت دێت رەنگی برینەکەی رەنگی خوێنە و بۆنەکەشی بۆنی میسکە).

٣)- ئەنەس خوا لیّ ی رازی بێت دەڵێ: مامم کەئەنەسی کوڕی (النّضر)ە لەشەڕی بەدردا ئامادە نەبوو، لەبەر ئەوە بە پێغەمبەری فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا من ئامادە نەبووم لەیەکەم شەڕ کەتۆ هاوەڵ پەیداکەر (مُشْرِك)ەکانت تێدا کوشت، ئەگەر خوای گەورە شەڕی هاوەڵپەیداکەرەکانم پێ نیشانبدات، ئەوا دەبینی من چی دەکەم، پاشان کەشەڕی ئوحود ڕوویدا، موسڵمانەکان هەرت بوون و شکان، ئەنەس وتی: خوایە من داوای لێ بووردنت لێ دەکەم لەوەی کە ئەمانە کردویانە (واتەموسڵمانەکان) چونکە هەڵهاتن و شکان، هەروەها من دوورم لەوەی

ئەوانە (واتە هاوەڵپەیداکەرەکان) دەیکەن چونکە لە ریّ ی خـوا لایـان داوە و کافرن. ئینجا چووە پێش و تووشی سەعدی کوڕی موعـاذ بـوو و پـیّ ی ووت: سەعدی کوڕی موعاذ بەهەشت! قەسەم بەپەروەردگاری بـاوکم (وربّ النضر) من بۆنی بەهەشت دەکەم لەپێش چیای ئوحود، جـا سـەعد ووتـی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من نـەمتوانی وەکـو ئـەو بکـەم، ئەنەسـیش ووتی: پاشان بەکوژراوی بینیمان لەهەشتا شوێن زیاتر لەشـی بریندارکـراوە بە شمشێر یا بە رم یا بە تیر ،(مشرك)ەکانیش لاشەکەیان شـێواندبوو بۆیـە کـەس نەیناسـیەوە تـەنیا خوشـکەکەی تـەبێت ئـەویش بـەهۆی سەرەپەنجەکانییەوە، ئەنجا ئەنەس دەڵی ئێمـە وامـان دەزانـی ئـەم ئایەتـە لەبارەی ئەنەسی کوڕی (النّضر) و هـی وەك ئـەم هاتۆتـە خـوارەوە: ﴿مِـنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَاهَدُواْ اللّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَـهُ وَمِنْـهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُواْ تَبْدِيْلاً.﴾ (ألأحزاب:٢٣). واتـە: (لـەناو ئیمـانداراندا کەسـانێك هـەن راسـتگۆ بـوون لـەو پەیمانـەیان کـە دابوویـان بـەخوا، جاهەندێکیان شـەهیدبوون و هـەندێکیان چـاوەڕوانن لەسـەر راسـتگۆیی و وەفاداری خۆیان ماون) ، بوخاری گێڕاویەتیەوە.

٤) دایکی حارثة کەدەکاتە کچی سوراقە دەڵێت چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خوا پێم نالیّ ی حارثة ی کوڕم لەکویّ یە؟ (چونکە حارثة پێش شەڕی بەدر تیرێکی پـیّ کـەوتبوو شـەهید ببـوو) ئەگەر لەبەهەشتە تا ئارام بگرم، ئەگەر لەجێیەکی تریشە ئەوا بۆی بگریم. پێغەمبەریش فەرمووی ئەی دایکی (حارثة) بەهەشت چەند باخچەیەکـە و کوڕەکەی تۆش لەبەهەشتی هەرەبەرزی فیردەوسە). بوخاری گێڕاوی یە تـی یەوە.

جا بڕوانە برای خۆشەویست چۆن بەهەشت خەم و ناخۆشی موسـڵمانانی پێشووی لەبیر دەبردنەوە و تینی خۆراگراتـن و ئـارام گرتنـی پێدەبەخشـین لەکاتی ناخۆشی.

٥) عـەبدوڵلای کـوڕی ئـەبی ئـەوفا (خـوا لیّ ی رازی بـیّ) دەڵـیّ:- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((إعلموا أن الجنّة تحت ظلال السّيوف)). واتە: (بزانن بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێراندایە) . (بخاری) و(مسلم) و(أبو داود) گێڕاویانەتەوە.

٦) لەزەیدی کوڕی خالدی ئەلجوهەنی (خوا لیّ ی رازی بـیّ) دەگێڕنـەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من جهّز غازيا في سبيل الله تعالى فقد غزا ومن خلّف غازيا في سبيل الله تعالى بخير فقد غزا)) واتـە: هـەر کەسێك مجاهدێك ئامادەبکـات واتـە کەرەستەکانی غـەزا و جیـهادی بـۆ ئامادەبکات وەك ئەوە وایـە کـەخۆی غـەزای کردبێـت. هـەر کەسـێکیش لەشوێنی غەزا کەرێك بمێنێتەوە و ئیش و کارەکانی بۆ جـیّ بـەجیّ بکـات وەك ئـەوە وایـە کەغـەزای کردبـیّ) (بخاری ومسلم وأبوداود وترمـذي) گێڕاویانەتەوە.

٧) لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کەپێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: ((من احتبس فرسا في سبيل الله إيمانا وتصديقا فإن شبعه وريّـه وروثـه في ميزانـه يـوم القيامـة)) بخـاری گێڕاویەتیـەوە. واتـە: (هەرکەسـێك ئەسـپێك ببەستێتەوەو لەپێناوی خوا، واتە: تێری بکا و ئامادەی بکا بۆ سوار بـوون لەغەزادا بەمەرجیّ بڕوای بە خـوا هـەبیّ ویسـتبێتیّ بـەڵێنی خـوا بـەجیّ بگەیەنیّ، ئەوا تێربوون و تێرخواردنەوەو تەرسی ئەسپەکەی هەمووی بەخێر بۆ دەنووسریّ و پاداشتی لەسەر وەردەگریّ) بوخاری گێڕاویەتیەوە. جالێرەدا

مەرج نییە تەنیا ئەسپ بێت بەڵکو هەرشت وەکو ئەسپ ئیش جـێ بـەجێ بکات.

٨)هـەروەها لەلایـەن ئـەبو هورەیـرەوە هـاتووە کـە وتوویانـــە ئـــەی پێغەمبەری خوا: چ شتێك هەیە وەك "جیهاد" بێ لەرێ ی خوادا؟ ئـەویش فەرمووی: ناتوانن! جا دوو سێ جـار لـێیان دووبـارە کـردەوە وە ئـەویش هەموو جارێك دەیفـەرموو نـاتوانن! پاشـان فـەرمووی: ((مثـل المجـاهد في سبيل الله كمثل الصـائم القـانت بآيـات الله لا يفـتر مـن صيـام ولا صلاة حتى يرجع المجاهد)). هەموو ئیمامەکانی حدیث ئەمەیان گێڕاوەتـەوە بێجگە لە أبوداود. واتە: (نموونـەی موجـاهید لـەرێگای خـوادا وەك ئـەو کەسە وایە رۆژووگربێ و شەونوێژ بکا و قورئان بخوێنێ و لەسەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بێ تا ئەوکاتـەی موجـاهید دەگەڕێتـەوە) . واتـە موجـاهید تـا لەجیهاد دەگەڕێتەوە خێری وەکو ئەو کەسە وایە

٩) ئـەبو سـەعیدی خـودری (خـودا لـێ ی رازی بێـت) دەگێڕێتـەوە ودەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ألا أخـبركم بخير النـاس وشـرّ النّاس، إن من خير النّاس رجلا عمل في سبيل الله على ظهر فرسه أو ظـهر بعيره أو على قدمه حتى يأتيه الموت، وإن من شرّ الناس رجلا يقـرأ كتـاب الله تعالى لا يرعوى بشيء منه)) النسائى گێڕاویەتیەوە.

لایرعوی: واتە: قورئانەکە کاری تێناکـا و وای لـێناکات واز لەخراپـە بێنێ.

واتە: (ئایا پێتان بڵێم چاکترین کەس و خراپترین کەس کێ یە؟ چاکترین کەس پیاوێکە لە پێناوی خوادا تێکۆشاوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی، یاخود حوشترەکەی یا بەپێ ی خۆی، تاکو مردنی توش دێت، خراپـترین کەسـیش

پیاوێکه قورئان دەخوێنێ کەچی ئەو قورئانە کاری تێ ناکا و وای لێ ناکات واز لە خراپە بێنێ).

١٠) لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕاویانەتەوە (خودا لیّ ی رازی بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیستووە فەرموویەتی: ((عینان لا تمسّهما النار: عین بكت من خشیه الله وعین باتت تحرس فی سبیل الله تعالی)).ترمذي گێڕاویەتیەوە.

واتە: (دوو چاو هەنە کە بە ئاگر ناسووتێن، یەکێکیان چاوێکە لەترسی خوا گریابێ، ئەوی تریان چاوێکە لەرێگای خوادا شەوخوونی کێشابێ و سەنگەری پاراستبێ).

١١).ئەبو عومەیرە (خودا لیّ ی رازی بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:- ((لئن أُقتلَ في سبيل الله أحبّ إليّ من أن يكون لي أهل المدَر والوبَر)).

أهل المدر والوبر: واتە: خەڵکی شارستان ولادێ.

واتە: (کوژرانم لەرێگای خوا پێ خۆشترە لەوەی خەڵکی شارستان و لادێم هەموو لەپشت بێ) .

١٢) راشیدی کوڕی سەعد (خودا لیّ ی رازی بێت) لەیەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی مردوو لە گۆڕدا سزا دەدرێن و تووشی فیتنە دێن تەنیا شەهید نەبێت؟ ئەویش فەرمووی: ((كفاه ببارقة السّيوف على رأسه فتنة)) النّسائی دەگێڕیتەوە.

واتە: (ئەوەندەی بەسە کە شمشێر لەژوور سەریدا بریقەی بێت).

ئا ئەمانەن دەست کەوتەکانی شەهید لێرەدا، ئایا دەبێ چی تری وەك ئەمەی دەست کەوێ، هەروەك ئێستا دێینەوە سەر باس کردنی، جا گوێ بگرە.

١٣) ئەبو هورەیرە (خودا لیێ ی رازی بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما يجد الشّهيد من مسّ القتل إلاّ كما يجد أحدكم من مسّ القرصه)).

واتە: (شەهید هەر ئەوەندە هەست بەئازاری مردن دەکات وەك ئەوەی یەك لە ئێوە هەست بەئازاری قونجرکەیەك یا گەزەیەك دەکات) . ترمذی و النسائی و الدارمی دەگێڕنەوە، ترمذی دەڵێ: حديث حسن غريب. ئەمەش دەس کەوتێکی ترە بۆ شەهید.

١٤) ئیبن مەسعوود (خودا لیێ ی رازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ((عجب ربّنا تبارك وتعالى من رجل غزا في سبيل الله، فانهزم أصحابه فعلم ما عليه فرجع حتى أريق دمه، فيقول الله للملائكة أنظروا الى عبدي رجع رغبة فيما عندي وشفقاً مما عندي حتّى أريق دمه أشهدكم أنيّ قد غفرت له)).

شفقاً: لەترسان، أريق دمه: خوێنی رژێنراوە.

واتە:(خوای گەورە سەیری لە پیاوێك دێ کە لە پێناوی خوادا غەزای دەکرد، کەچی هاوەڵەکانی هەڵاتن و شکان و ڕایانکرد، بەڵام ئەو زانی ئەرکی سەر شانی خۆی چی یە، لەبەر ئەوە گەڕایەوە و شەڕی کرد تا شەهید کرا، ئینجا خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو، سەرنج بدەنە ئەو بەندەیەی من، منی خۆش دەوێ و لێم دەترسێ، هەر لەبەر ئەوەش گەڕایەوە تاکو شەهید کرا، ئێوە بەشایەت بن من لیێ ی خۆش بووم) .

١٥) عەبدولخەیر کوڕی ثابیتی کوڕی قەیس لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە باپیری دەگێڕیتەوە و دەڵێ: جارێکیان ئافرەتێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کەناوی دایکی خەللاد بوو، پێچەکەی دادا بوو، پرسیاری کوڕەکەی دەکرد کە لەڕێگای خوادا شەهید کرابوو. جا هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر لێ یان پرسی و گوتیان: هاتی بۆ پرسیار کردن لە کوڕەکەت، کەچی خۆت داپۆشیوە و پێچەت داداوە: ئەویش گوتی ئەگەر کوڕەکەم لە دەست چووبێ ئەوا شەرم و حەیای خۆم لە دەست نادەم، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی فەرموو((إن ابنك له أجر شهيدين)) واتە: کوڕەکەت چاکە و پاداشتی دوو شەهیدی پێ دراوە، ئەویش گوتی بۆ چی؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((لأنه قتله أهل الكتاب)) واتە چونکە ئەهلی کتاب (واتە جوو و دیان) کوشتوویانە.. أبوداود گێڕاویەتیەوە.

ئەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خاوەنی کتێبەکان (جوو و دیان)ەکانیش پێویستە شەڕیان لەگەڵدا بکرێ، جا خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسەی کە جیهادیان لەگەڵ دەکات زیاد دەکات چونکە جیهاد تەنیا لەگەڵ گاور و(مشرك)ەکان نییە، بەڵکو لەگەڵ هەر کەسێکە کە موسڵمان نەبێ.

١٦) لەسەهلی کوڕی حەنیف (خودا لێ ی رازی بێت) وەرگیراوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من سأل الله الشّهادة بصدق بلّغه الله منازل الشّهداء وإن مات على فراشه)).

واتە: (هەرکەسێك بەراستی داوای شەهید بوون لە خوا بکات ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێتە ریزی شەهیدەکان، هەتا لە سەر نوێنیش بمرێ) هەر پێنج ئیمامەکان دەیگێڕنەوە بێجگە لە بخاری.

١٧) له خوره‌یمی کوری فاتیك وه‌رگیراوه (خودا لێ ی رازی بێت) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی ((من انفق نفقة في سبيل الله تعالى كتبت له بسبعمائة ضعف)).

واته:(هه‌رکه‌سێك شتێك ببه‌خشێ له پێناوی خوادا، ئه‌وا حه‌وسه‌د جار به‌قه‌د ئه‌وه‌ی که به‌خشیویه‌تی چاکه‌ی بۆ ده‌نووسرێ) . ترمذي ونسائی ده‌یگێڕنه‌وه.

١٨) ئه‌بو هوره‌یره (خودا لێ ی رازی بێت) ده‌گێڕیته‌وه و ده‌ڵێ: یه‌کێك له هاوڕێکانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به دۆڵێکدا تێ په‌ڕی، که کانیاوێکی بچووکی سازگاری تێدا هه‌ڵده‌قوولا، ئه‌م کانیاوه سازگاره سه‌رنجی راکێشاو، له‌دڵی خۆیدا گوتی واباشه له خه‌ڵك دووربکه‌ومه‌وه و ژیانی خۆم له‌م دۆڵه ببه‌مه‌سه‌ر، جائه‌م قسه‌یان بۆ پێغه‌مبه‌ر گێڕایه‌وه و ئه‌ویش فه‌رمووی ((لاتفعل فإن مقام أحدكم في سبيل الله أفضل من الصّلاة في بيته سبعين عاما، ألا تحبُّون أن يغفر الله لكم ويدخلكم الجنّة، أُغزوا في سبيل الله، من قاتل في سبيل الله فواق ناقة وجبت له الجنّة)).

واته: (وامه‌که چونکه شوێنی هه‌ر یه‌کێکتان له رێگای خوا(واته له سه‌نگه‌رێك یا گۆڕه‌پانێك له گۆڕه‌پانه‌کانی غه‌زاکردن) چاکتره له حه‌فتا ساڵ نوێژ کردنی ئه‌وکه‌سه له‌ماڵی خۆیدا، ئایا حه‌زناکه‌ن خوا لێتان خۆش بێ و بتانباته به‌هه‌شت، ئه‌وا له پێناوی خوادا غه‌زابکه‌ن ، هه‌رکه‌سێکیش له پێناوی خوا شه‌ڕبکات بۆ ماوه‌ی نێوان دووجار دۆشینی ووشترێك (واته بۆماوه‌یه‌کی زۆر کورت) ئه‌وا به‌هه‌شتی بۆ پێویست ده‌بێ). ترمذي ده‌گێڕیته‌وه.

١٩) ميقدادی کوڕی (معد يكرب) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((للشّهيد عند الله ستّ خصال: يغفر له في أول دفعة ويُرى مقعده من الجنة، ويجار من عذاب القبر ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار، الياقوتة منه خير من الدنيا وما فيها، ويُزوّج إثنين وسبعين زوجةً من الحور العين ويشفع في سبعين من أقربائه)).

واتە: (شەهید لەلای خوا شەش خەسڵەتی هەیە، لەکاتی رژانی یەکەم دڵۆپ لەخوێنی گەشی خوا لێ ی خۆش دەبێ و جێگای خۆی لە بەهەشت دەبینێ، لە سزای قەبر دەپارێزرێ و لەمەترسی رۆژی قیامەتیشدا ئەمین دەبێ، تاجی رێزلێنانی دەخرێتەسەر، کە یاقووتێکی ئەم تاجە دنیا و ئەوەی لەدنیادایە دەهێنێ و حەفتا و دوو حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێ، شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لەخزمەکانی دەکات). ترمذی وئیبن ماجە دەگێڕنەوە.

٢٠) ئەبو هورەیرە (خودا لێ ی رازی بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من لقى الله بغير أثر من جهاد لقى الله وفيه ثلمة)).

واتە: (هەر کەسێك بەخزمەت خوا بگات (واتە بمرێت)، هیچ شوێنەواری جیهادی لەسەر نێوچەوانی نەبێت، ئەوا بێگومان بەعەیب داری و کەم و کوڕی بەخزمەت خوا دەگات) . ترمذي و ئیبن ماجە دەگێڕنەوە.

٢١) ئەنەس (خودا لێ ی رازی بێ) دەگێڕێتەوە و دەڵی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من طلب الشهادة صادقاً أعطيها ولو لم تصبه)).

واتە: (هەر کەسێك بەراستی داوای شەهید بوون لەخوا بکات، ئەوە خوای گەورە ئەو پلەیەی پێدەدا ئەگەر شەهیدیش نەبێ) . مسلم گێڕاویەتەوە.

٢٢) عوسمانی کوڕی عەففان (خودا لـێ ی ڕازی بێت) دەڵـێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((من رابط ليلة في سبيل الله سبحانه وتعالى كانت كألف ليلة صيامها وقيامها)).

واتە: (هەرکەسێك شەوێك سەنگەر بپارێزێت لـەڕێ ی خـوا، وەك ئـەوە وایە کەهەزار ڕۆژ بەڕۆژوو بێ و بەشەویش شەو نوێـژ بکـات) إبـن ماجـە گێڕاویەتەوە.

٢٣) ئەبو دەردا (خـودا لـێ ی ڕازی بـێ) دەڵـێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی ((غزوة في البحر مثل عشر غزوات في البرّ والذي يسدر في البحر كالمتشحطّ في دمه في سبيل الله)). یسـدر: دەهـەژێ،دەلـەرزی، رادەشلەژێ.

واتە: (غەزایەك لەدەریادا وەکـو (دە) غەزایـە لەسـەر وشـکانی، ئـەو کەسەی لەناو کەشتی بهەژێ و ڕاشلەژێ وەك ئەوە وایە لەناو خوێنی خۆیدا بگەوزێ).

إبن ماجە گێڕاویەتەوە.

ئەمەش نیشانەیە بۆ غەزا کردن لەدەریا و، ئاگادار کردنەوەی میللـەت بۆ گرنگی چاودێری کردن و پارستنی سنوورە دەریاییەکان و بـەهێز کردنـی (أسطول) ەکانی جەنگ ،هەربـەم پێیـەش دەتوانـین ئاسمـانیش لـەم جـۆرە بژمێرین، جا خوای گەورە ئەوانەی لەئاسماندا غەزا دەکـەن، بەچـەند قـات زیاتر پاداشتیان دەداتەوە.

٢٤) جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خـودا لـێ ی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ: کاتێ (عبدالله)ی کـوڕی عـەمری کـوڕی حـیرام لەشـەڕی ئوحـودا کوژرا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- جابر ناتەوێ بزانی خوای گەورە چـی دەربارەی باوکت فەرمووە؟ وتم: بەلـێ، فـەرمووی: خـوای گـەورە کەسـی

نەدواندووە تەنیا مەگەر لەپشت پەردەوە نەبێ، بەڵام باوکی تۆی راستەوخۆ دواندووە و فەرموویەتی: ئەی بەندەی من! چیم لێ داوا دەکەی تاکو بت دەمێ، ئەویش وتوویەتی: خوایە بمگەڕێنەوە بۆ دنیا (واتە جارێکی تر بمژیێنەوە) تاکو جارێکی تر لەپێناوتا بکوژرێم، جا خوا دەفەرموێ: من لەپێشدا گوتوومە (وام داناوە) کەکەس ناگەڕێنمەوە، گوتی: خوایە ئەم شتە بەوانەی دوای من بگەیەنە، پاشان خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِيْنَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتًا ... تادوایی ئایەتەکە.﴾ (آل عمران:١٦٩). ئیبن ماجە دەگێڕێتەوە.

٢٥) لەئەنەس و باوکی (خوا لێ یان رازی بێ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لئن أشبع مجاهداً في سبيل الله فأكفّفه على رحله غدوة أو روحة أحبّ إليّ من الدنيا وما فيها)).

فاكفّفة على رحله: واتە: (یارمەتی بدەم تاکو سواری وڵاخەکەی دەبێ، الغدوة: بەیانی، الروحة: ئێوارە.

واتە(ئەگەر موجاهدێك کەلەپێناوی خوادا جیهاد دەکات تێرکەم و یارمەتی بدەم تاکو سواری وڵاغەکەی دەبێت لەبەیانی و ئێوارەدا، ئەوە لەلام خۆشترە لەدونیا و ئەوەی لەدنیادا هەیە) . إبن ماجە گێڕاویەتەوە.

٢٦) ئەبو هورەیرە (خوا لێ ی رازی) بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((وفد الله ثلاثة الغازي والحاجّ والمعتمر)).

واتە: (نوێنەری خوای گەورە سێ کەسن، غەزا کەر وحاجی (واتە ئەوکەسەی لەحەج دایەو حەج دەکات و ئەو کەسەی عومرەی بەستووە) . مسلم گێڕاویەتیەوە.

٢٧) ئەبو دەردا (خوا لێ ی رازی بێ) دەگێڕتەوەو دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يشفع الشّهيد في سبعين من أهل بيته)).

واتە: (شەهید شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لەخزم و کەسی خۆی دەکـات) . ئەبو دەردا گێڕاویەتیەوە.

**٢٨)** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لـێ ی رازی بـێ) دەگێـڕێتـەوە و دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا تبايعتم بالنّسيئة وأخذتم أذناب البقر ورضيتم بالزرع وتركتم الجهاد سلّط الله عليكم ذلاً لاينـزعه عنكم حتى ترجعوا إلى دينكم)).

واتە: (ئەگەر هاتوو کڕین و فرۆشتنتان بەسوود(ربـا)بـوو و دوای ئـاژەڵ کەوتن و بەکشت وکاڵ رازیبوون و بەس، وازتان لەجیهاد کردن هێنا، ئـەوا خوای گـەورە تووشـی سـەر شـۆڕیەکتان دەکـات کەلـێ ی دەربازنـابن و رزگارتان نابێ تاکو نەگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەتان (مەبەست لـێرەدا ئەوەیەکـە موسڵمانان نابێ وازبێنن لەخۆ ئامادەکردن و گرنگی دان بـە پیشەسـازی و بەهێزکردنی سەنگەر و سنوورەکان و تەنیا خۆیان بەکشت و کاڵەوە خەریك بکەن).

**٢٩)** ئـەبو هوریـرە (خـوا لـێ ی رازی بـێ) دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی لەشاری مەدینەوە دەرچوون تاکو پێش هاوەڵ پـەیدا کـەران (مشـرك)ەکـان گەیشـتنە کانیاوەکـانی بـەدر، پاشـان (مشـرك)ەکـانیش هـاتن ئـەنجا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: هەسـتن بـۆ بەهەشتێك کەپانایيەکەی وەکـو پانـایی ئـەرز و ئاسمـان وایـە، لـەو کاتـە عومەیری کوڕی حەمام وتی: چۆن چۆن؟ پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: چی وای لـێ کردیت تابڵـێ ی چۆن چـۆن؟ عومـەیرش (خـوا لـێ ی رازی بێ) ووتی: نا بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچ شتێ وای لـێ نەکردم ئەمە بڵێم، تەنیا داواکردنی ئەوەنەبێ کە ببمە خەڵکی بەهەشت، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ بەهەشتییت (واتە: خەڵقی بەهەشتی) ئەنجا عومـەیر

دەنکە خورماکانی لە باخەڵی دەرهێنا و دەستی بەخواردنی کرد پاشان بیری کردەوەو لەدڵی خۆیدا گوتی ئەگەر هاتوو من ئەم دەنکە خورمایانە تەواو بکەم بێگومان ئەمە ماوەیەکی زۆری دەوێت، لەبەر ئەوە ئەو چەند دەنکە خورمایەی کە پێ ی بوو فڕێیدا و رای کرد بۆ شەڕ لەگەڵ (مشرك)ەکان تاکو شەهید کرا) مسلم گێڕاویەتیەوە.

٣٠) ئەبو عیمران دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لە شاری رۆم بووین کەریزێکی زۆر گەورەمان لە رۆمەکان بۆ دەرچوون، لە موسڵمانەکانیش هەمان هێند، یان زیاتریان بۆ دەرچوون، خەڵکی (میسر) سەرکردەیان عوقبەی کوڕی عامر بوو و سەرکردەی کۆمەڵیش -لێرەدا روونی نەکردووە ئایا کۆمەڵ کێ بوون- فوزالەی کوڕی عوبەید بوو، ئالەم کاتەدا موسڵمانێك شالاوی هێنا بۆ سەر ریزێك لە رۆمەکان تا چووە ناویان، موسڵمانەکانیش یەکسەر هاواریان کرد و وتیان (سبحان الله) ئەمە بەدەستی خۆی خۆی دەفەوتێنێ، لەم کاتەدا ئەبو ئەییوبی ئەنصاری هەستاو ووتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە بەم جۆرە لێك دەدەنەوە و (تأویل) دەکەن، کەچی لەراستیدا ئەم ئایەتە بۆ ئێمەی ئەنصاری یەکان هاتە خوارێ ، کاتێ خوای گەورە ئیسلامی بەرزکردەوە و لایەنگرانی زۆر بوون هەندێکمان بەنهێنی لە ناوەخۆدا بەبێ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بزانێ گوتمان ئێمە ماڵ و داراییمان لەدەست چوو، خوای گەورەش ئیسلامی سەرخست و لایەنگرانی زۆر بوون، چی تێدایە ئەگەر بێتوو ئێمە لەناو ماڵ و دارایی خۆماندا دانیشین و ئەوەی لێمان فەوتاوە پەیدای کەینەوە، جا خوای گەورە یەکسەر ئایەتی ناردە خوارەوە و فەرمووی:﴿وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ.﴾(البقرة : ١٩٥) واتە: (بەدەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن) واتە لەراستیدا خۆفەوتاندن (التهلكة) بریتی بوو لەمانەوە لەناو ماڵ بۆ

کۆکردنەوەی ماڵەکە و وازهێنان لەغەزا کردن، جا هەتا ئێستاش ئەبو ئەییوب لەپێناوی خوا دەگەڕا و شەڕی دەکرد تا لەوڵاتی رۆم نێژرا) . ترمذي گێڕاویەتیەوە.

جا خوێنەری خۆشەویست تەماشای ئەبو ئەییوبی ئەنصاری بکە، کاتێ کەئەمەی گوتووە لەتەمەنێکی گەورەدا بووە، لەتەمەنی لاوێتی تێپەڕ کردووە و بەرەوپیری چووە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵ و گیان و ئیمانی نموونە بووە بۆ هێزو تینی لاوێتی، بەیارمەتی خوا و بۆ عیززەتی ئیسلام.

٣١) ئەبو هورەیرە (خوا لێی رازی بێ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من مات ولم يغزو ولم يحدّث نفسه بالغزو مات على شعبة من النِّفاق)).

واتە: (هەرکەسێك مرد و لەپێناوی خوادا غەزای نەکردبوو و بیریشی لێ ی نەدەکردەوە، ئەوا لەسەر هۆیە (شعبە)یەك لەهۆیەکانی دووڕوویی‌دا مردووە). مسلم و أبوداود گێڕاویانەتەوە.

زۆر فەرموودەی لەم شێوەیە هەیە. فەرموودەی پیرۆز و بەنرخ لەم بارەیەوە و لەشێوەی ئەمەگەلێك زۆرە، کە باس دەکات غەزاکردن لەدەریا چەند جار خێری زیاترە لەغەزاکردن لەسەر وشکایی، هەروەها باسی غەزا کردن دەکات لەگەڵ خاوەن کتێبەکان جا بۆ باس کردنی فەرمانەکانی جیهاد کردن بەدرێژی ئەگەر بێتوو بەرگێکی گەورەش بنووسرێت ئەوا هەر بەش ناکات، بۆ نموونە سەیری کتێبی (العبرة فيما ورد عن الله ورسوله في الغزو والجهاد والهجرة) کەخاوەنەکەی (سید حسن صدیق خان)ە کەتایبەتە بەم باسە، کتێبی (منازع الأشواق الى مصارع العشاق ومثير الغرام الى دار السلام) هەروەها ئەوانەی کە لەکتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوون لەبارەی جیهاد، زۆر شتی خۆشی تێدا دەبینی.

# حوكمی جیهادكردن لەلایەن زانایانی ئیسلام

لەمەو بەر هەندێ ئایەتی پیرۆز و فەرموودەی بەنرخت بــەرچاو كـەوت، لەباسی گەورەیی و مەزنی جیــهاد دەدوا، لـێرەدا مــن دەمــەوێ هــەندێك لەقسەی زانایانی مەزهەبەكانت بۆ بێنمەوە، نەك تەنــها ئەوانــەی پێشــوو، بەڵكو ئەوانەی ئەم دواییەش، تاكو بزانی چۆن لەبارەی فەرمانەكانی جیهاد و پێویســتییەكانی خۆئامــادەكردن دواون و باســیان كــردووە، هــەروەها بۆئەوەی بزانی تاچ رادەیەك نەتەوەی ئیسلام فەرمانەكانی ئاینەكەی لەبیر چۆتەوە،ئەمــەش بەشـایەتی و قســەی هــەموو موسـڵمانەكان و لەهــەموو چەرخەكانیدا و بەدرێژایی مێژووەكەی..

جا گوێ بگرە..

١) خـاوەنی كتێبـی (مجمـع الأنـهر في شـرح ملتقـى الأبحر) لەباســی فەرمانــەكانی جیــهاد لەمەزهــەبی حەنــەفی دا دەڵێـت جیــهاد لــەزوبانـدا بریتییە لە بەخشینی ئەوەی لەدەسـت مـرۆڤ دێـت، بەقســەو بــەكردەوە، لەشەریعەتیش دا بریتییە لەكوشتنی كافران و شتی تری لەم بابەتــە، وەك: لــێ دانیان و تالان كردنی ماڵیان و روخاندنی پەرسـتگاكانیان و شـكاندنی بتەكانیان، مەبەست لەم هەمووشتانەش بــەهێزكردنی ئاینــە، بەشــەڕكردن لەگەڵ جەنگاوەرەكان (الحربیین)، ئەوكەسانەی كە پــەیمانیان لــە ئەسـتۆیە، ئەگەر هــاتوو پەیمانەكـەیان شـكاند، هــەروەها هەڵگـەڕاوەكان (المرتـدون) كەپیس ترین جۆری كافرەكانن لەپەیمان شكاندن، پاش بەسـتنی پەیمانەكـە، هەروەها ئەوانەی كەبەڕووی فەرمانڕەوایی ئیسلامی راستدەبنەوە (البغاة)،

ئەمەش پێویستی سەرشانی هەندێکە (فـرض الكفايـة)[8] يـە ، جاپێویسـتە لەسـەرمان کەدەسـت بکـەین بەشـەڕکردن لەگـەڵ ئەوانـە، پـاش ئاگـادار کردنەوەیان، هەرچەندە ئەوان شەڕمان لەگەڵ نەکەن، پێویستە لەسەر ئیمام ساڵـێ جارێك پەلێك بۆ سەر مەڵبەندی جەنگخوازان (دار الحـرب) بنـێرێ، لەسەر میللەتیش پێویستە یارمەتی بدەن، جا ئەگـەر هـەندێ بـەم ئیشـە هەستان ئەوا لەسەر ئەوانی تر لادەچێ، بەڵام ئەگـەر ئـەوانیش نـەیانتوانی بەجێ ی بهێنن و ژمارەیان تەوا و نەبوو، ئـەوا پێویسـتە لەسـەر ئەوانـەی کەلـێیانەوە نزیکن بەدەنگیانەوە بچن و هەروەها بەم جۆرەش هتد. جـا ئەگەر هاتوو ئەوانیش نەیانتوانی، ئـەوا لەسـەر هـەموو خـەڵك پێویسـت دەبێت بچن، دەبێتە پێویستی سەر شانی هەموو کەسـێك (فـرض العـين)[9]ە وەکو نوێژ، چونکە خوا دەفەرموێ ﴿فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ.﴾ (التوبة:٦) . واتە: ( هاوبەش پەیداکەرەکان بکوژن) ، هەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ ((الجهاد مـاض الى يـوم القيامـة)) واتـە: جیـهاد هـەردەمێنێ تـا ڕۆژی قیامـەت ، ئەگـەر خـەڵکیش هـەموو وازی لـێ بێنـن ئـەوا هـەموویان گوناهباردەبن هەتا دەڵـێ: ئەگەر هاتوو دوژمن وڵاتێك لـە وڵاتـەکانی ئیسلامی، یا هەرێمەك لەهەرێمەکانی داگیر کرد، ئەو کاتە جیهاد دەبێتـە پێویستی سەرشانی هەموو کەسێك ئەو کاتە دە بێـت ئـافرەت و بـەندەش دەربچن بەبێ وەرگرتنی پرس و ڕای مێرد و خاوەنەکانیان، هـەروەها منـاڵ

---

[8] –فرض الكفاية: بەو پێویستییە (واجب)ە دەڵێن، کە ئەگەر هاتوو هـەندێك پـێ ی هەستان ئەوا لەسەر ئەوانی تردەکەوێـت.

[9] – فرض العين: بەو پێویستییە دەڵێن کە دەبێ هەموو کەسێ پێ ی هەستێ

بەبێ پرس پێکردنی دایك و باوکی و قەرزار بەبێ پرس پێکردنی خاوەن قەرزەکەی.

هەروەها لەکتێبی ((البحر))دا هاتووە ((ئەگەر ئافرەتێکی موسڵمان لەرۆژهەڵاتدا دەست بەسەر کراو ئەسیرکرا، ئەوا لەسەر موسڵمانانی رۆژاوا پێویستە بەهانایەوە بێن و رزگاری بکەن ئەگەر هێشتا نەچوو بووە قەڵا و سەنگەری دوژمن هتد)).

٢)خاوەنی کتێبی (بلغة السالك لأقرب المسالك في مذهب الامام مالك) دەڵێ: هەموو ساڵێك جیهاد کردن لەپێناوی بەرزکردنەوەی وشەی خوا پێویستی سەرشانی هەندێکە، واتە ئەگەر هاتوو هەندێك پێ ی هەستان ئەوا لەسەر ئەوانی تر لادەچێت، هەروەها ئەگەر ئیمام فەرمان بدات بەجیهاد ئەوا دەبێتە پێویستی سەرشانی هەموو کەسێك (فرض العین). (واتە وەك نوێژ و رۆژوو دەبێتە پێویستی سەر شانی هەموو کەسێك)، یاکاتێ دوژمن هێرش بۆ سەر گەڕەکێك دێنێ ئەوکاتە جیهاد دەبێتە پێویستی سەرشانی هەموو کەسێك لەخەڵکی ئەم گەڕەکە، ئەگەر ئەوانیش نەیانتوانی ئەوا لەسەر ئەوانەی کەلێیانەوە نزیکن پێویست دەبێ، لەحاڵەتی وادا دەبێتە پێویستی سەرشانی ئافرەت و بەندەش (الرقیق)ە، هەرچەندە خاوەنەکانیان وەك لێ پرسراو ومێرد و گەورەیان رێیان لێ بگرن، کەسانی قەرزاریش پێویستی سەرشانیانە، هەروەها بەلەخۆ گرتنیش پێویست دەبێ، تەنیا لەحاڵەتی پێویست بوون لە سەرشانی هەندێکدا دەتوانن رێگا لەمنداڵەکانیان بگرن و نەهێڵێن بچن، رزگار کردنی ئەسیریش لەدەست جەنگاوەرەکان، کاتێ پارەی نەبێ خۆی پێ رزگار بکات ئەوا پێویستی سەرشانی هەندێکە کەیارمەتی بدەن ئەگەر هاتوو هەموو ماڵی موسڵمانان بۆ رزگارکردنی ببەخشرێ هتد.

٣) لەکتێبی (متن المنهاج)ی إمام نووی الشافعی دا هاتووە کەجیهاد لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پێویستی سەرشانی هەندێك بووە، دەڵێن پێویستی سەرشانی هەموو کەسێك بووە بەڵام پاش ئەم سەردەمە جیهاد لەگەڵ کافران بۆتە دوو جۆر:

یەکەم: ئەگەر هاتوو کافرەکان لەوڵاتی خۆیان بوون ئەوکاتە پێویستی سەرشانی هەندێکە، ئەگەر بەشێك لەموسڵمانان واتە ئەوانەی توانایان هەیە پێ ی هەستان ئەوا لە سەر ئەوانی تر لادەچێ.

دووەم: ئەگەر دوژمن بێتە ناو شارێك لەشارەکانمان پێویستە لەسەر خەڵکی شارەکە دەریان بکەن، بەوەندەی لەدەستیان دێت، ئەگەر لەتوانادا هەبوو خۆ ئامادەبکرێت بۆشەڕ، ئەو کاتە ئەو لەتوانا بوونە دەبێتە پێویست، هەتا لەسەر هەژار و قەرزار و بەندەش پێویست دەبێ، بەبێ پرس وەرگرتن.

٤) لەکتێبی (المغنی) لإبن قدامە الحنبلی دا دەڵێت: مەسەلەی جیهادیش پێویستی سەرشانی هەندێکە، ئەگەر هاتوو هەندێ پێ ی هەستان ئەوا لەسەر شانی ئەوانی تر لادەکەوێت، هەروەها لەسێ شوێندا دەبێتە پێویستی سەرشانی هەمووان.

أ- ئەگەر دوو لەشکر بەرەنگاری یەك بوون و بەیەك گەیشتن، ئەوا لەسەر ئەو کەسەی کەئامادە بووە لەم شەڕەدا حەرامە رابکا و پێویستە لەسەری کەبمێنێتەوە.

ب- ئەگەر کافرەکان چوونە ناو شارێك، لەو کاتەدا لەسەر خەڵکی شارەکە پێویست دەبێ بیان کوژن و دەریان بکەن.

ج- ئەگەر ئیمام داوای لەکۆمەڵێك کرد پێویستە لەگەڵی بچن و کەمترینی ئەوەیە هەموو ساڵێ جارێ ئەو شتە داوابکات.

ئەبوعەبدوڵلا واتە (ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) دەڵـێ: نازانم لەپاش فەرزەکان شتێك هەبێت لەجیهاد گـەورەتربێت، غـەزا کـردن لـەناو دەریـا خێری زیاترە لەغەزاکردنی وشکایی.

ئەنەسی کوڕی مالك (خوالـێ ی رازی بـێ) دەڵـێ پێغەمبـەر (ﷺ) جارێك خەوی لـێکەوت پاشان لەخەو هەستا.. پێ کەنی، دایکـی (حـیرام) (کەئافرەتێك بوو) لـێ ی پرسی ئەی پێغەمبەری خـوا بۆچـی پـێ کـەنی؟ ئەویش فەرمووی: هەندێك لەنەتەوەی خۆمـم پـێ پیشـان درا کەلـەپێناوی خوا غەزایان کردبوو و سواری کەشتی دەریا بوون، وەکو چۆن پاشـا لەسـەر ئاوریشم و قەنەفەی خۆیدا دەبێ ئەوانیش وابوون) متفق علیە.

تەواوی فەرموودەکەش بەم شێوەیە: دایکی حیرام داوای لـە پێغەمبـەر کرد کەلە خوا داوابکـات تـاکو ئـەمیش ببێتـە یـەکێك لەمانـە، ئنجـا پێغەمبەر (ﷺ) داوای بۆ کرد، ئەویش تەمەنی گەورەبوو، تا جارێ چـووە سـەر پشـتی کەشـتی لەگـەڵ ئـەو ئوسـتوڵەی (الاسـطول) موسـڵمانان کەقوبرسیان پێ رزگار کرد، پاشان لەوێدا مرد و نێژرا، تـا ئێسـتا لـەوێدا مزگەوتێك و شوێنێك هەیە بەناوی ئەوەوە ناونراوە (خوا لـێ ی رازی بێ).

٥) إبن حزم الظاهري لـەکتێبی المُحَلّی لەباسـی جیـهادا دەڵـێ: جیهاد لەسەر موسـڵمانان پێویسـتە، جـا ئەگـەر هـاتوو هـەندێك پـێ ی هەستان (واتە بۆ دەرکردنی دوژمن و هێرش بردنە سەریان لەناو ماڵیـان و پاراستنی سەنگەری موسـڵمانان) ئـەوا پێویسـتییەکە لەسـەر ئـەوانی تـر لادەکەوێ، ئەگەر هاتوو کەس نەبوو بەم کارە هەستێ، ئەوا لەسەر ئـەوانی تریش پێویست دەبێ، چونکە خـوای گـەورە فەرموویـەتی ﴿إِنْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجاَهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ....﴾ (التوبـة:٤١) ئەمـەش بـەپرس و رای دایك و باوك نەبێ ناکرێ. تەنیا لە کـاتێکدا دوژمـن بێتـە ناوخـاکی

موسـلمانان، ئەوکاتـە هـەموو موسـلمانێك توانـای هـەبێت پێویسـتە یارمەتیان بدات، روویان تێبکات و بەتەنگ هاواریانەوە بچێت، جـالێرەدا دایك و باوك رازی بن یان نا، گرنگ نییە، تەنیا مەگـەر یـەکێکیان بمرێـت یاخود بزربێت، ئەو کاتە نابێ بەجێیان بهێڵـی.

٦) الشوکانی لەکتێبی (السَّیل الجَرّار) دا دەڵی ئـەو بەڵگانـەی لەسـەر پێویست بوونی جیهاد لەقورئان و پەیرەوی پێغەمبەردا هاتوون لەوە زیاترن کەلێرەدا باس بکرێن، بەڵام ئەمانە هەموویان پێویستی سەرشانی هەندێکە واتە ئەگەر هاتوو هەندێك پێ ی هەستان ئـەوا لەسـەر شـانی ئـەوانی تـر دەکەوێت، پێش ئەوەی ئەو کۆمەڵە هەبێت کە بەم کارە هەستن ئەوا دەبێتە پێویستی سەرشانی هەموو کەسێکی (مُکلّف) و، کەسێکیش ئیمـام داوای دەرچوونی لـێ بکات دەبێت بە گوێ ی بکات، چونکە ئەمە (فرض العین)ە لەسەری.

ئا بەم جۆرە لەم وتە جوانانەی پێـش چـاوت، بـۆت روون بـووەوە چـۆن زانایان و(فقهاء) کانی ئیسلام بەهەموو جۆرێکیانـەوە لـە (مجتـهدین)[١٠] و (مقلّدیـن)[١١] و(سـلفییّن)[١٢] و (خلفیـین)[١٣] هـەموویان لەسـەر ئـەوە رێـك کەوتوون کەجیهاد لەسەر نەتـەوەی ئیسـلام بـۆ بڵاوکردنـەوەی بانگـەوازی ئیسلامی، پێویستی سەرشانی هەندێکە، بەڵام بۆ بەربەسـتکردنی هێرشـی کافران بۆ سـەر موسـلمانان پێویسـتی سەرشـانی هـەموو کەسـێکە، جـا

---

[١٠] - مجتهدین: خاوەن مەزهەبەکان .

[١١] – مقلدین: ئەو زانایانەی شوێن ئیمامەکان دەکەون.

[١٢] – سلفیین: ئەوانـەی کـەوا دوای پێغەمبـەر هـاتبوون(هـاوەڵان، تـابعین، تـابعی تابعین....).

[١٣] – خلفیین: ئەوانەن کە دوای سێ نەوەکەی پێشوو هاتوون.

بێگومان دەبینی چۆن حاڵی موسڵمانەکان شپرزاوە بەجۆرێك کەوتوونەتە ژێر دەستی خەڵکی تر ، کافرەکان فەرمانڕەواییان دەکەن، خاکیان داگیرکراوە ، ماف و رێز و پایەیان خوراوە و پێ شێلکراوە، دوژمنان دەستیان خستۆتە ناوکار وباریان و بۆ خۆیان بەڕێوەی دەبەن، تەنانەت وای لێهاتووە دروشمەکانی ئیسلام لەناو ولاٚتانی خۆیاندا لەکار خراوە، ئەمەو جگە لەساردی و تەمەڵی موسڵمانان لە بلاٚوکردنەوەی بانگەوازەکەیان، کەواتە ئێستا و لەم سەردەمەدا جیهاد لەسەر هەموو کەسێك پێویستە و هیچ رێ ی ئەوەی تێدانییە بۆ خۆشاردنەوە و دواکەوتن، دەبێت هەموو موسڵمانێك خۆی رێك بخات و نیەتی جیهاد بێنێت و کار و کەرەسەی خۆی بۆ ئامادە بکات، تاکو وچان و ساتی خۆی دێت و ئەوەی کەخوا دەیەوێت دێتەدی. وا دەزانم ئەو باسە تەواو نابێت، تاکو ئەوەتان بۆ روون نەکەمەوە کەموسڵمانەکان لەهەر سەردەمێك لەسەردەم و چاخەکانی مێژوویاندا، واتە پێش ئەم سەردەمە تاریکەی ئێستا کەپیاوەتی و غیرەتی تێدا نەماوە و مردووە، هەرگیز تەمبەڵی و سستی یان نەکردووە لەجیهاد کردن و بگرە لەوانە زانا و سۆفی و کاربەدەستان و هی تریش بەگشتی، هەموو دەم ئامادە بوون. بۆ نموونە (عەبدوڵلای کوڕی موبارەك) زانا و زاهیدی بەناوبانگ، لەزۆربەی کاتدا بەجیهاد کردن خەریك بووە، هەروەها (عەبدولواحیدی کوڕی زەیدی) سۆفی بەناوبانگیش وابووە، (شەقیق ئەلبەلخی) کەلە کاتی خۆیا شێخی سۆفیەکان بووە، خۆی و قوتابیەکانی بۆ جیهاد کردن هانداوە. (بەدرولعەینی)کە کتێبی بۆخاری راڤە کردووە و خۆیشی (فقیە)و فەرموودەزان بووە ساڵێك جیهادی کردووە و ساڵێکی تریش زانستی بلاٚو کردۆتەوە، ساڵێکی تریش حەجی کردووە، (قازی ئەسەدی کوڕی فوراتی مالیکی)، فەرماندەی سەردەریا بووە، ئیمامی

شافیعیش تـیر هـاوێژ بـووە و دەتـیری هاویشـتووە و هـەموو جـارێکیش نیشانەی شکاندووە، ئا ئەمانە بوون باوك و باپیرانی ئێمە خوالـێیان رازی بێت، ئەی ئایا حاڵی ئێمە چۆنە و شوێننمان لەچ قوژبنێکـی ئـەو مێـژووە پیرۆزە دایە؟.

## لەبەرچی موسڵمان شەڕ دەکات؟

ماوەیەك داهات خەڵك ئیسلامیان بەوە تاوانبار دەکرد، گوایـە ئیسـلام جیهادی فەرز کردووە و دەرگای شەڕ و شۆڕی کردۆتەوە تـاکو ئـەم ئایەتـە هاتەدی کە خوا دەفەرموێ ﴿سَنُرِيهِمْ آياتنـاَ في آلأفَـاقِ وَ فِي أنْفُسِـهِمْ حَتَّـى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أنَّهُ الْحَقُّ.﴾ (فصّلت: ٥٤) .ئا ئێستا ئەوان دان بەوە دەنێـن کـە ئامادە کردن باشترین ڕێگایە بۆ ئاشـتی، خـوای گـەورەش جیـهادی فـەرز نەکردووە، تاکو ببێتە ئامرازێك بۆ دەست درێژیکردن، یاهۆیەك بۆ گەیشـتن بـەچاوتێبڕینی شەخسـیی، بـەڵکو بـۆ پاراسـتنی بانگـەوازی ئیسـلام و دابینکردنی ئاشتی فەرزی کردووە، هەروەها بۆ ڕاگەیاندنی ئـەو پەیامـەی کە ئەرکەکەی کەوتۆتە سەرشانی موسڵمانان، ئەو پەیامەش ڕێنمایی کـردن و ڕێپیشاندانی خەڵکە بۆ ڕێگـەی ڕاسـت و ڕێگـەی دادپـەروەری، ئیسـلام هەرچەندە شەڕی فەرزکردووە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاشتیشی پیرۆز کردووە و هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا للسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهاَ وَتَوكَّلْ عَلَى اللَّهِ....﴾ (الانفال:٦١). واتە: ( ئەگەر هاتوو بۆ لای ئاشـتی و شـەر ڕاگرتن دەچوون تۆش بۆ ئاشتی بچۆ و پشت بە خوا ببستە).

جاکاتێ موسڵمانێك بۆ شەڕ دەچـوو تـەنیا یـەك مەبەسـتی لـەدڵدابوو ئەویش کەدەبێت جیهاد بکات تاکو وشەی خوا بەرزبکاتەوە بەسەر هـەموو

وشەیەکی تردا، ئاینەکەی لەسەری فەرز کرد بوو لەگەڵ ئەم مەبەستە هیــچ شتی تری لەدڵدا نەبێت، چونکە ناوو دەنگی لـــێ حـەرام بـوو، خۆپیشـان دانیشی لـێ حەرام بوو، دەسـت کـەوت (غنیمـة)یشـی لـێ حـەرام بـوو، هەروەها زاڵ بوونی بە ناحەقیشی لـێ حەرام کرابوو، تەنیا ئەوەی بۆ حەڵاڵ بوو کەگیان و خوێنی لەپێناوی بیروباوەڕەکەی و لەپێناوی ڕێ نمایی خــەڵك پێشکەش بکات.

حاریسی کوڕی موسلیمی کوڕی حاریس لە باوکیـەوە بیسـتوویەتی کـە دەڵی: پێغەمبەر (ﷺ) ئێمـەی لەگـەڵ پـەلێکدا نـارد، تاگەیشـتینە لای ئەشکەوتێك، منیش لەئەسپەکەم راخوڕی و پێش هاورێکانم کەوتم، خەڵکی گەڕەکەکە بەهات و هاوار بەلای مندا هاتن و منیش پێم وتـن: بڵێـن " لا إله إلا الله " رزگار دەبن و دەپارێزرێن ئەوانیش بەگوێ ی منیـان کـرد و، گوتیان، کەچی هەندێ لەهاورێکانم ئەمەیان بەدڵ نەبوو ، گوتیان، خوابـت گرێ لەم دەستکەوتەت بێ بەشکردین، پاشان کەهاتینەوە بۆلای پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەی من کردبووم بۆیان گێڕایەوە، ئەویش بانگی کردم و کارەکەی پەسەند کردم ووتی:- خوای گەورە بۆ هەر مرۆڤێك (واتــە بـۆ هەرکەسـێك کەتۆ بوویتە هۆی ئەوەی هاورێکانت نـەی کـوژن ئەمـەندە پاداشـتەی بـۆ نوسیوی، پاشان وتی: ئەوا من وەسـیەتێکت بـۆ دەنووسـم بیـدە بەوانـەی لەدوای من دێن و پاشان مۆری لـێ دا و دای بەمن) ئەبوداود گێڕایتیەوە.

شەددادی کوڕی هاد (خوا لــێ ی رازی بـێ) دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت:- (ئەعرابی)[14] یەك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بڕوای پــێ هێنـاو پاشـان وتی لەگەڵ تۆدا کۆچ دەکەم، جا پێغەمبـەریش (ﷺ) وەسـیەتی هـەندێك

---

[14]- واتە: عەرەبی بیابان نشین.

لەهاوەڵەکانی کـرد، تـاکو ئاگـاداری بـن، لـەم کاتـەدا غـەزایـەك روویـدا پێغەمبەریش دەسکەوتەکەی لەسەر هاورێکانیدا بەش کرد، جـا ئـەعرابی یەکە وتـی ئەمـە چـی یـە؟ ئـەویش فـەرمووی: ئـەوە بەشـی تۆیـە لـەم دەسکەوتە. ئەویش وتی: من بۆ ئەوە دوای تۆ نەکەوتووم، بەڵکو من بۆیـە دوای تۆ کەوتم هەتالێرەم بدرێ ـ دەستی بۆ گەردنی درێـژ کـرد ـ بـەتیرێ تاکو بمرم و بۆ بەهەشت بچم. ئەویش فەرمووی ئەگەر لەگـەڵ خـوا راسـت بکەیت ئەوا خواش راستت بۆ دێنێ، پاشان کەمێك مانەوە ئەنجا هەستان و چوون بۆ شەڕکردن لەگـەڵ دوژمـن، دوای ماوەیـەك لەسـەر شـان هـەڵیان گرتبوو و بۆ پێغەمبەریان هێنا، لەو شوێنەی کەدیاری کردبوو تیرێکی پـێ کەوتبوو، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بینی وتی: ئەوە ئەوە؟! ئـەوانیش وتیـان بەڵـێ، ئەویش فەرمووی بەراستی لەگەڵ خوادا راست بوو بۆیە خوا راستی بۆ هێنا، دوایی لەجوبەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پێچایانەوە و کفنیـان کـرد، پێغەمبەریش لەپێش خۆی دانا و نوێژی لەسەر کـرد، لـەو قسـانەی کەلـە نوێژەکەیدا وتی ئەمە بوو، ((أللّهم هذا عبدك خرج مهاجراً في سبيلك فقُتل شهيداً وأنا شهيد على ذلك)). النّسائي گێڕاویەتەوە.

ئەبو هورەیرە (خوا لـێ ی رازی بێت) دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ:- پیـاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاو هەیە لـەڕێ ی خوادا جیهاد دەکات و دەیەوێت لـەدنیادا هـەندێ شتیشـی دەسـتکەوێت، پێغەمبەریش فەرمووی: هیچ پاداشتی بۆ نییە، جا کابرا سێ بارەی کردەوە و پێغەمبەریش هـەر دەیفـەرموو هیـچ پاداشـتی بـۆ نییـە) (أبـو داوود) گێڕایتەوە.

ئەبوموسـا (خـودا لیٚ ی رازی بێـت) دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: لـە پێغەمبەریان (ﷺ) پرسیار کرد، دەربارەی پیاوێك کە بۆ ئازایەتی یان بـۆ

خوێن گەرمی یا بۆ ریاکـاری شـەڕدەکات، ئایـا کـام لەمانـە لـە ڕێگـای خوایە؟! ئەویش فەرمووی ((من قاتل لتكون كلمه الله هی العليـا فـهو فی سبيل الله)) واتە: (ئەو کەسەی تەنیا بۆ بەرزکردنـەوەی وشـەی خـوا شـەڕ بکات ئەمە لە پێناوی خوا دایە).

ئەگـەر سـەرنج بدەینـە ئـەو ڕووداوانـەی کـە لەسـەردەمی هـاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوویان داوە ئەو ڕەفتارە جوانانەی کـە ئـەوان گرتوویانـە بەرلە شـەڕکردن لەگـەڵ خـەڵکدا، لـەو شـوێنانەی کـە فـەتحیان دەکـرد و ڕزگاریان دەکرد، بۆمان دەردەکەوێت ئەوان تا چ رادەیەك لە چاو تێـبڕین و تەماعکاری دووربوون، چۆن ئارەزووی خۆیان خستۆتە لاوە و خۆیـان تـەنیا بـۆ مەبەسـتە سـەرەکییە ڕەسـەنەکەیان تـەرخان کـردووە، ئـەویش کـە ڕێپیشاندانی خەڵکە بۆ ڕێگای راسـت، تـاکو وشـەی خـوا سـەردەکەوێت، پاشان ئەم هەڵە گەورەیە دەبینی لەوانەی کەئەم یارانەی پێغەمبەر تاوانبار دەکەن، کەگوایە تەنیا دەیانویسـت دەسـت بـە سـەر میللـەتان دابگـرن و زۆرداری بڵاو بکەنەوە و بەدوای ڕۆزی پەیداکردندا بگەڕێن.

## ڕەحم وبەزەیی پیاهاتنەوە لەجیهادی ئیسلامی

لەبەر ئەوەی مەبەستی جیهادی ئیسلامی زۆر پیرۆزە ، هەر بۆیەش ئەو هۆیانەی کەبەکاری هێنا پاکترین هۆ بوون، چونکـە خـوای گـەورە دەسـت درێژی کردنی حەرام کردووە، هەر وەکـو دەفـەرمووێ: ﴿وَلا تَعتَدُوا إِنَّ اللهَ لايُحِبُّ المُعتَدِينَ.﴾ (البقرة: ١٩٠) واتە: (دەستدرێژی مەکەن چونکە خـوای گەورە دەستدرێژکەرانی خۆش ناوێ) ، بەڵکو داوای دادپـەروەری کـردووە، هەتا لەگەڵ دوژمن وناحەزانیشدا هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿وَ لايَجْرِمَنَّكُمْ

شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى ألاَّ تَعْدِلُوا إِعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى.﴾(المائدة:٢)واتە: (حەز نەکردنتان لە قەومێك واتان لیّ نەکات بە داد پەروەری لە گەڵیان نەجولێنەوە بەڵکو دادپەروەربن چونکەدادپەروەری نزیکە لە خواترسان). جا بۆ یە موسڵمانەکانی بۆ ئەوپەڕی بەزەیی پێداهاتنەوە و ڕەحم پێکردن ڕێنمایی کردووە، چونکە ئەوان کاتێ شەڕدەکەن، دەست درێژی ناکەن، خراپەکاری ناکەن، لاشەی مردوو ناشێوێنن و دزی ناکەن،ماڵی خەڵك تالاّن ناکەن، دەست درێژی ناکەنە سەر ئابڕوو و ناموسی خەڵك، تایەکێك ئازاریان نەدا ئەوان کەس ئازار نادەن، چونکە لەکاتی شەڕ کردنیاندا ئازا و مەردانە چاکترین شەڕ کەرن، هەروەك لەکاتی ئاشتیدا باشترین ئاشتیخوازن.

بورەیدە (خوا لیّ ی ڕازی بێ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر یەکێکی بکردایە بە فەرماندە لەسەر سوپایەك یاخود پەلێك، وەسیەتی فەرماندەکەی دەکرد کە خۆی و ئەوانەی نزیکن لیّ ی لەخوا بترسن و لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیاندا دان بە چاکە بجولێنەوە و مامەڵە بکەن، پاشان دەیفەرموو:

((غەزا بکەن بەناوی خوا و لەڕێ ی خوادا، ئەو کەسە بکوژن کە کافرە، غەزا بکەن و کاتێ شتێکتان دەست کەوت، کەس نەی شارێتەوە بۆ خۆی، دەست بۆ کەس درێژمەکەن، لاشەی مردوو مەشێوێنن، منالّی ساوا مەکوژن)) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

ئەبو هورەیرە (خوا لیّ ی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((إذا قاتل أحدکم فلیجتنب الوجه)) بخاری ومسلم

گیراویانەتەوە.

واتە:(ئەگەر یەکێك لەئێوە شەڕی کرد پێویستە لەکاتی لێدان خـۆی لـە دەم وچاو بپارێزێ).

ئیبن مسعود (خوا لێ ی رازی بێـت) دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((أعفُّ الناس قِتلةً أهل الايمان)).

واتە: (پاکترین کەس لەمرۆڤ کوشتن پیاوی ئیماندارە)، ئـەبوداود دەری هێناوە .

عەبدوڵلای کوڕی یەزیدی ئـەنصاری (خـوا لـێ ی رازی بێـت) دەڵـێ پێغەمبەر (ﷺ) (نەهی کردووە لەتالآن کردن و شێواندنی لاشەی مـردوو) .بوخاری گێڕاویەتەوە.

هەروەها نەهی کردن لەکوشتنی ئافرەت، منالّ و، پیاوی پـیر، برینـدار ،ئازار دان و بێزار کردنی رەبەنەکان و ئەوانەی خۆیان دوورەپەرێز گرتـووە و ئەوانەی کەشەڕ لەگەڵ موسڵمانەکان ناکەن هاتووە،جا ئەم رەحـم پێکردنـە لە کوێ و ئەو هێرشە دڕندانە و کارەساتە نامەردانەی ئەو دەوڵەتـە خـاوەن شارسـتانێتیانە لـەکوێ؟ کوانـێ یاسـای دەوڵـەتانی ئـەوان بەرانبـەر بـەم دادپەروەریە گشتییەی کەلە پەیڕەوی خوادا هەیە؟

خوایە موسڵمانەکان تێ بگەینە لە ئاینەکەی خۆیان و ئاگاداریان بکەوە و ئەو جیهانە تاریکەش بەرۆشنایی ئیسلام رۆشن بکەرەوە.

## ئەوانەی بەناوی جیهادەوە هەڵبەستراون

لەناو زۆر لەموسڵمانەکان بڵاوبۆتەوە کەشەڕکردن لەگـەڵ دوژمـن بچـو کترین جۆری جیهاد (الجـهاد الاصغـر)ە و جیـهادێکی تـر هەیـە کـەدەڵێن ئەمەگەورەترین جۆری جیهادە (الجهاد الاکبر)، کەئەویش جیهادی نەفسـە، بەڵگەشیان ئەوەیە کەبیستراوە ((رجعنـا مـن الجـهاد الاصغـر إلی الجـهاد الاکبر قالوا وما الجهاد الاکبر؟ قال جهاد القلب أو جهاد النفس)).

واتە: (لەجیـهادی بچوکـتر گەڕاینـەوە بـۆ جیـهادی گـەورەتر، وتیـان جیهادی گەورەترین چی یە؟ فەرمووی جیهادی دڵە، یان جیهادی نەفسـە)، هەندێکیان دەیانەوێ بەم شتە خەڵك سارد بکەنەوە لەبایەخدان بەشەڕ کردن و خۆئامادە کردن بۆی، بەڵام ئەم قسەیە لەڕاستیدا فـەرموودەیکی ڕاسـت (صحیح) نییە، چونکە پێشەوای موسڵمانان لەفەرموودەناسی (الحافظ إبـن الحجر) دەڵـێ: ئەم قسەیە لەسەر زار بڵاوبۆتـەوە کەچـی لەڕاسـتیدا ئەمـە قسەی (ئیـبراهیم) ی کـوڕی (عیلـە)یـە و زانـای (العراقـی) لـەدەرهێنان (تخریج)ی فەرموودەکانی کتێبی (الاحیاء)دا، دەڵێ: البیهقی لە ڕێگەیـەکی لاوازەوە ئەمەی لە جابر گێڕاوەتەوە، هەروەها (الخطیب) ئەمـەی لـە جـابر گێڕاوەتەوە ،جا ئەگەر ڕاستیش بێت، مانای ئەوە نـادات خـەڵك لەجیـهاد کردن و خۆ ئامادەکردن بـۆ ڕزگـار کردنـی وڵاتـانی موسـڵمان و بەرپـەرچ دانەوەی هێرشی کافرەکان دەست هەڵگرن، بەڵکو ماناکەی وایـە پێویسـتە ئادەمیزاد جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆیدا بکات تاکو لەهـەموو کـارێکدا بـۆ خوای گەورەی پاك دەکاتەوە.

هەندێ شتی تر هەیە پەیوەندی بەجیهادەوە هەیە لەوانە: فەرماندان بەچاکە و نەهی کردن لەخراپە، هەروەکو لە فەرمودەی پێغەمبەر هاتووە ((إن من أعظم الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)).

واتە: گەورەترین جیهاد ئەوەیە قسەیەکی حەق بکەی بەرانبەر دەسەلاتدارێکی زۆردار.

بەلام هیچ کامێك لەمانە ئەو پلە گەورەیەی شەهیدی پێنادرێ تاکو لەرێگای خوادا نەکوژرێ و بێ باوەڕان نەکوژێ.

## لە کۆتاییدا

ئەی برایان: ئەو نەتەوەیەی دەستێکی کارامە و نەخشینی هەیە لەپیشەی مردن و دەزانێ چۆن پیاوانە و مەردانە دەمرێت، بێگومان ئەوا خوای گەورە ژیانێکی سەر بەرزانە لە دونیا و خۆشیەکی هەتا هەتایی لە رۆژی دواییدا پێ دەبەخشێت و ئەو بێ هێز (الوهن)ی یە کە تووشمان بووە و سەرشۆڕی کردووین هەمووی لەئاکامی خۆشەویستی دونیا و ترسانە لە مردن، جا خۆتان ئامادە بکەن بۆ کارێکی مەزن، بەرەو رووی مەرگ بڕۆن تاکو ژیانتان پێ ببەخشرێت.

باش بزانن دەرباز بوون لە مردن مەحالە ئەویش تەنها جارێك روودەدات جا ئەگەر لە پێناوی خوادا بێ ئەوا دەبێتە مایەی قازانجی دونیا و پاداشتی رۆژی دوایی، ئەوەی خوای گەورە لە سەری نەنووسیبێ بەسەرتان نایەت، ئێوەش باش بیربکەنەوە لە فەرموودەی خوای گەورە کە دەفەرمووێ:

ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الغَمِّ أَمَنَةً نُعَاساً يَغْشَى طَائِفَةً مِنْكُمْ وَطَائِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنْفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللهِ غَيْرَ الحَقِّ ظَنَّ الجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَلْ لَنَا مِنَ

الأَمْرِ مِنْ شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ للهِ، يُخْفُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ مَا لايُبْدُونَ لَكَ، يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَا قُتِلْنَا هَا هُنَا قُلْ لَوْ كُنْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ القَتْلُ إِلى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَاللهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ. ﴾ (آل عمران:١٥٤).

واته: (له پاشان به دواى ئه‌م غه‌مه‌دا هێمنایی بۆ ناردن، ئه‌م هێمناییه به وێنه‌ى خه‌وێكى سووك بوو كه تاقمێك له ئێوه سه‌ر خه‌ویان شكاند. به‌لاّم تاقمێكى دیكه‌تان له بیرى گیانى خۆیاندابوون و به ناڕه‌وا له بابه‌ت خواوه به ناهه‌ق گومانیان ده‌كرد. هه‌روه‌كو گومانى سه‌رده‌مى جاهیلییه‌ت ده‌یان گوت: ئایا كارمان ده‌گاته چى؟ بلّێ: به‌ڕاستى هه‌موو كاروبار به ده‌ست خوایه، ئه‌وانه شت گه‌لێكیان له دلّ و ده‌روونى خۆیاندا ده‌شارده‌وه و لاى تۆ ئاشكرایان نه‌ده‌كرد، ده‌یانگوت ئه‌گه‌ر به‌ده‌ست ئێمه بوایه لێره‌دا به كوشت نه‌ده‌چووین، بلّێ ئه‌گه‌ر له مالّى خۆشتانیش بوونایه، ئه‌وانه‌ى وا كوژران له چاره‌یان نووسرابوو، ئه‌گه‌ر له ناو پێخه‌فیش دابان هه‌ر بۆ جێگاى كوژران ده‌چوون ئه‌مه له‌به‌ر ئه‌وه‌یه تا خوا ئه‌وه‌ى وا له سینگتاندایه تاقى بكاته‌وه‌و ئه‌و بڕوایه‌ى له‌دلّ و ده‌روونتاندایه بپالێوێ و خوا ئاگاو زانایه به‌وه‌ى وا له دلّ و ده‌رووندایه).

جا ئێوه‌ش بۆ ئه‌م مردنه پیاوانه‌یه جوان ئیش بكه‌ن، تاكو به‌ختیارى ته‌واوتان ده‌ست بكه‌وێت، خواى گه‌وره پایه و پله‌ى شه‌هیدبوون به‌ئێمه‌و ئێوه ببه‌خشێت.

ته‌واو بوو به یارمه‌تى خوا.

وه‌رگێڕان: ١٩٨٢

بسم الله الرحمن الرحيم

ئیمـام (إبـنُ القَیِّـم) داهـاتنی جیـهادی لـه ئیسـلامدا، لەبـەندێك لەبەندەکانی کتێبەکەی (زاد المعـاد) دا بـەکورتی بـاس کـردووە، بـەناوی ((بەشێك لەرەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە گەڵ کـافران و دووڕوان، لـەکاتی بوونی بەپێغەمبەر تا کاتی وەفات کردنی)).

یەکەم شت خـوای گـەورە بـۆ پێغەمبـەری نـاردە خـوارەوە ئـەوە بـوو کەبخوێنێ بەناوی ئەو خوایەی کە خەڵقی دروست کردوە، ئەمەش سـەرەتای پێغەمبەرایـەتی بـوو، لـەدوایی دا فـەرمانی پێکـرد لـەدڵی خۆیـدا بیخوێنێتەوەو بێ ئەوەی هیچ شتێك رابگەیەنێ، پاشـان کـردی بـە (نـبیّ) بەئایەتی (إقرأ) لەدواییدا کردی بەنێردراو (رسـول) بـە ئایـەتی ﴿یَـا أیُّـهَا الـمُدَّثِّرْ قُمْ فَأَنْذِرْ .﴾، فەرمانی پێدا ئـەو خـزم و کەسـانەی کـە لێـوەی نزیکن بترسێنێ، لەدواییدا قەومەکەی و پاشان ئەو عەرەبانـەی لـەدەوریدا هەن، پاشان هەموو عەرەب و لەدوایشدا هەموو جیهان بترسێنێ، پاشان بۆ مـاوەی سـێزدە سـاڵ دوای پێغەمبەرایـەتی دەیترسـاندن و بانگـەوازی پێڕادەگەیاندن بەڵام بێ سـەرانە وەرگرتـن! لـەو کاتـەدا فـەرمانی دەست هەڵگرتن و خۆڕاگرتن و لێبووردنی پێدرا. لەدواییدا رێگـەی کـۆچ کـردن و پاشانیش رێگەی شەڕکردنی پێ درا. پاشان خـوای گـەورە فـەرمانی پێـدا شەڕبکا لەگەڵ ئەوەی شەڕی لەگەڵدا دەکا و هـەقی بەسـەر ئـەو کەسـەوە نەبێ کە خۆی لێ دوور کردۆتەوە و شەڕی لەگەڵدا ناکات، پاشان فـەرمانی

دایێ شەڕ لەگەڵ (مشرك)ەکان بکات، تاکو ئایین[15] هەر بۆ خوا بـێ.. جـا لە دوای فەرمانی جیهاد کردن کافرەکان لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بونـە سێ بەش: بەشی شەڕ راگر و ئاشتی ویستن، بەشـی شـەڕ خـوازان، بەشـی خەڵکی لەئەستۆ.. ئینجا فەرمانی پێدرا ئەوانەی خاوەنی پەیمان و ئاشـتی ویستنن پەیمانەکەیان بگەیەنێتەجێ و لەگەڵیاندا بەوەفابێ تا ئەوان لەسـەر ئەو پەیمانە بمێننەوە، ئەگەر ترسـا لـەوەی خیانـەتی لەگـەڵدا بکـەن ئـەوا پەیمانەکە هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام شەڕیان لەگـەڵدا ناکـات تـاکو هـەواڵی هەڵوەشانەوەی پەیمانەکـەیان پێنـەڵێت، فـەرمانی پێـدرا لەگـەڵ ئەوانـەی پـەیمانیان هەڵوەشـاندۆتەوە شـەڕ بکـات پاشـان کەسـوورەتی (بـراءة) هاتەخوارەوە حوکمی هەموو ئەو بەشانەی روون کردەوە:

فەرمانی پێدا شـەڕ بکـات لەگـەڵ دوژمنـە خـاوەن کتێبـەکان (أهـل الکتاب) تاکو سەرانە دەدەن یا دێنە سەر ئـاینی ئیسـلام ، خـوای گـەورە فەرمانی پێدا کەخۆی لادا لەو پەیمانانەی کە لەگەڵ کافرەکاندا هـەیبووە و هەڵیبوە شێنێتەوە، خاوەن پەیمانەکانیشی لەم بارەیەوە کـرد بەسـێ بـەش: بەشـێکیان فـەرمانی پێـدا کەشـەڕیان لەگـەڵدا بکـات، واتـە ئەوانـەی کەپەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە و لەسەری نەڕۆیشتوون، ئەویش شەڕی لەگەڵدا کردن و بەسەریاندا زاڵ بوو. بەشێکیان پەیمانێکی کاتی لەگەڵیاندا هـەبوو، بەڵام هـەڵیان نەوەشـاندبووەوە و یارمـەتی دوژمنـەکانی پێغەمبەریشـیان نـەدەدا، بـۆ ئەوانـەش خـوای گـەورە فـەرمانی پێـدا پەیمانەکـەیان بگەیەنێتەجێ، تاماوەکەی تەواو دەبێ.

---

[15] - مەبەست لەئایین ئەوەیە: خواپەرستی وفەرمانڕەوایی هەربۆخوابێ

بەشێکیشیان هیچ پەیمانیان لەگەڵیدا نەبوو، شەڕیشیان لەگەڵدا نەکردبوو، یاخود پەیمانێکی رووتیان لەگەڵدا هەبوو، بۆ ئەمانەش فەرمانی پێدرا کەچوار مانگ دوای بخات، ئەگەر ئەو ماوەیەش تەواو بوو ئەوا شەڕیان لەگەڵدا دەکات. ئەویش کەوتە شەڕکردن لەگەڵ ئەوەی پەیمانی شکاندووە. ئەوەی کەپەیمانیشی لەگەڵدا نەبووە، یان پەیمانێکی رووتی هەبووە چوار مانگی دواخست. پاشان لەلایەن پەروەردگار فەرمانی پێدرا پەیمانەکە تەواو بکات لەگەڵ ئەوانەی وەفادار بوونە بۆ پەیمانەکەیان، ئەوانیش هەموو موسڵمان بوون و کەسیان لەسەر کافری نەمانەوە. لەسەر خەڵکی لەئەستۆشدا (أهل الذمة) سەرانەی دانا... ئینجا پاش هاتنە خوارەوەی سورەتی (براءة) کافرەکان بوونە سێ بەش: بەشێك شەڕیان لەگەڵ دەکرد، بەشێکیشیان پەیمانیان لەگەڵدا هەبوو، بەشەکەی تریان خەڵکی لەئەستۆ بوون. پاشان ئەو بەشەی پەیمان و ئاشتی ویستنیان لەگەڵدا هەبوو بوون بەموسڵمان... لێرەدا مانەوە دووبەش: شەڕکەر لەگەڵیدا و خەڵکی لەئەستۆ، ئەوانەی شەڕیشیان لەگەڵ دەکرد لەهەمان کاتدا لێی دەترسان، ئینجا خەڵکی سەر رووی زەمین لەگەڵیدا بوونە سێ بەش، موسڵمانە و باوەڕی پێ هێناوە، یا ئەوەتە بێ لایەنەو جێگەی مەترسی نییە، یا ئەوەتە شەڕی لەگەڵدا دەکات و لێی دەترسێ.. بەڵام رەفتاری لەگەڵ دووڕووەکان ئەوە بوو کەخوا فەرمانی پێدا رووالەتەکەیان لێ وەرگرێ و دڵ و دەروونیان بۆ خوا بەجێ بهێڵێت، تەنها بەروون کردنەوە و بەڵگە هێنانەوە جیهادیان لەگەڵدا بکات هەروەها فەرمانی پێدرا روویان لێ وەربگێڕێ و بەتوند و تیژی لەگەڵیاندا بجوڵێتەوە و بەقسەی کاریگەر

دڵیان رابکێشێ ، پاشان فەرمانی پێدرا لەکاتی مردن نوێژیان لەسەر نەکات و نەچێتە سەر گۆڕیان، پێ ی راگەیەندرا: هەرچەندە ئەو داوای پاڕانەوە و لێ بووردنیان بۆ بکات خوای گەورە لێیان خۆش نابێت و لێیان نابورێ.. ئەمەبوو رەفتار و پەیڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ دوژمنەکانی لەکافر و دووڕووەکان..

لەم روون کردنەوە پوختەیەدا بۆ قۆناغەکانی جیهاد لەئیسلام ، چەند نیشانەیەکی رەسەن و قووڵی پەیڕەوی بزوتنەوەیی ئەم ئاینەمان بەجوانی بۆ ئاشکرا دەبێت، کە شایەنی ئەوەیە بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەرامبەریدا بووەستین و لێ ی ووردبینەوە، بەڵام لێرەدا ئەوەندەمان لەتوانادا هەیە بەشێوەیەکی گشتی هێمای بۆ بکەین:

سیمای یەکەم: واقیعیەتی راستییە (الجِدِیَّة) لەپەیڕەوی ئەم ئاینە... و ... (ئەم ئاینە) خۆی بزوتنەوەیەکە رووبەڕووی واقیعێکی ئادەمیزادی دەبێت.. بەوهۆیانەی کە هاوتان لەگەڵ ئەم واقیعەدا.. و رووبەڕووی نەفامێتی (جاهلیة) یەکی بیروباوەڕی و بۆچوونی دەبێت، کەچەند رژێمی واقیعی کردەوەیی لەسەر وەستاوە، کەچەند دەسەڵاتداریەکی خاوەن هێزی ماددی پشتیان گرتووە.. بەم شێوەیە بزووتنەوەی ئیسلامی رووبەڕووی واقیع دەبێت بەگشتی بەو هۆیانەی کەهاوتان لەگەڵ ئەم واقیعەدا.. رووبەڕووی دەبێتەوە بە بانگەوازی و روون کردنەوە بۆ راست کردنەوەی بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیان، لەلایەکی تر بەزەبری هێز و جیهاد کردن رووبەڕوویان دەبێت بۆ لادانی ئەو رژێم و دەسەڵاتداریانەی کە لەسەر بناغەی ئەم بیروباوەڕ و بۆچوونانە دامەزراوە، ئەوانەی دەبنە کۆسپ و

لەمپەر لەرێگای خەڵك و ناهێڵن بەهۆی روون کردنەوە بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیان بۆ راست بکرێتەوە. کەبەهۆی زەخت و زۆری و رێ لێبزرکردن خەڵك بۆخۆیان مل کەچ دەکەن و دەیانکەن بەبەندەی کەسێکی تر بێجگە لەخوا.. لەراستیدا بزوتنەوەیەکە تەنها بەروون کردنەوە ناوەستێ لەبەرامبەر دەسەڵاتداری ماددی، هەروەکو بۆ راکێشانی دڵ و دەروونی خەڵکیش هێزی ماددی بەکارناهێنێ.. ئەمەش وەکو ئەوەی تریانە لەفەرهەنگی ئەم ئاینەدا کاتێ کەدەجوڵێتەوە بۆدەرهێنانی خەڵك لەبەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای تاك و تەنیا هەروەکو لەدواییدا باسی دەکەین.

سیمای دووەم: لەپەیڕەویی ئەم ئاینە واقیعیەتی بزوێنییە.. خۆی بزوتنەوەیەکە بەچەند قۆناغێکدا دەڕوات، هەر قۆناغێکی چەند هۆ و ئامرازی بارتەقای هەیە بۆ داخواز و پێداویستە واقیعیەکانی ، هەر قۆناغێکی دەدرێتە دەست ئەو قۆناغەی دوای خۆی کەدێت. چونکە تەنیا بەتیۆر و قسەی رووت بەرامبەری واقیع نابێت.

هەروەها رووبەڕووی قۆناغەکانی ئەم واقیعە نابێت بەهۆی بێ کەڵك و نابزێو.. ئەوانەی دەقەکانی قورئان دەهێننەوە وەك بەڵگە بۆ پەیڕەوی ئەم ئاینە لەجیهادکردندا ئەو سیمایەی تێدا بەرچاوناگرن. لەسروشتی ئەو قۆناغانەی کەئەم پەیڕەوەی پێداڕۆیشتووە ، هەروەها لەپەیوەندی نێوان ئەم دەقە جیاوازانە و هەر قۆناغێك لەقۆناغەکانی ناگەن..بێ گومان ئەوان لێرەدا هەڵەو تێکەڵیەکی گەورە دەکەن، بەرگێکی شێوا و لەبەر پەیڕەوی ئەم ئاینە دەکەن، چەند بنچینە و رێسایەك لەم دەقانە دەردەهێنن کەپاشان

هاتووەتـە خـوارەوە، کەدەقـەکان خۆیـان ئەمانـــە هــەڵناگرن و مانـــای واناگەیەنن. چونکە ئەوان وادادەنێن هەردەقێك ئەمە دەقێکـی کۆتاییـە و دوا ڕێسا(قاعدة)ی ئەم ئاینەیە و دەڵێن ئیسلام جیهادی تەنها بـۆ بـەرگری لەخۆی داناوە!! ئەمەش لـەکاتێکدا دەڵێـن کـەخۆیان لـەناوەوە ڕوخـاون و لەژێر پاڵەپەسـتۆی ئـەو واقیعـە بـیّ هیوایـەدا دەژیـن کـە ئـەو بێچـووە موسڵمانانە دروستیان کردووە، ئەو بێچووانەی کەفڕیان بەسەر ئیسـلامەوە نەماوە، تەنیا ناوونیشان نەبێت، وا دەزانن بەم کارەیان کەگوایـە (ئیسلام جیهادی بۆ بەرگری لەخۆی داناوە..) چاکە لەگەڵ ئـەم ئاینـە دەکـەن، بـە وازهێنانی لەو پەیڕەوەی گرتوویەتیە بەر ئەویش کـە بریتییـە لـەرامالین و لادانی هەموو تاغوتەکانی سەر رووی زەمـین بـە گشـتی و بـانگ کردنـی خەڵك بۆ بەندایەتی خوای گەورە بەتەنیا و ڕزگارکردنیان لەبەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای هەموو بەندەکان ، نەك بەزۆر خەڵك بهێنرێتە سەر ئەو بیروباوەڕە، بەڵکو بۆ ئەوەی هیچ بەربەستێك لـەنێوان خـەڵك و وەرگرتنـی ئەو بیروباوەڕە نەهێڵن.. پاش ڕوخاندنی ئەو ڕژێمە سیاسییە فەرمانڕەوایانە جا یان دەبێت بەزۆر سەرانە بدەن و یـان ئەوەتـە دەبـیّ رابگەیـەنن خۆیـان بەدەستەوە داوە و ئیتر نابنە بەربەست لەنێوان جەماوەر و ئـەم بیروبـاوەڕە، جەماوەریش لەو کاتەدا ئەو پەڕی سەربەخۆیی هەبێت، ئاخۆ ئەو بیروباوەڕە هەڵدەگرێت یان نا.

سیمای سیّ یەم: ئەوەیە کەئەم بزوتنەوەیە بیّ وچانە و ئەوهۆیە بەردەوام نویّ بووانەی بەکاری دێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئاینــە، ئیسـلام لەڕێسـا سنوردارەکان و ئامانجە نیشان کراوەکانی خۆی دەرنـاهێنن. خـۆی ـ هـەر

لەیەکەم رۆژ ـەوە کەلەگەڵ هۆزەکەی خۆی، یالەگـەڵ قورەیـش، یالەگـەڵ هەموو عـەرەبەکان، یا لەگەڵ جیهان دەدوا، لە راستیدا بـەپێ ی رێسـایەك لەگەڵیان دەدوا و داوای لێ دەکردن کەتەنیا بگەنە ئامـانجێك ئـەویش کـە دڵسۆزییە لەبەندایەتی بۆ خـواو دەرچوونـە لەبەندایـەتی بـەندەکان. هیـچ نەرمی نواندن و هاتنە خوارەوەیەك نەبوو لەم رێسایەدا.. پاشان بۆگەیشـتن بەم تاکە ئامانجە لەسەر نەخشەیەکی کێشراو دەڕۆیشت لەچەند قۆنـاغێکی سنووردیاری کراودا، کە بۆ هەرقۆناغێك هۆ و کەرەسـتەی بـەردەوام نـوێ بووەوەی خۆی هەبێت. وەکو لەمەو پێش باسمان کرد.

سیمای چوارەم: ئەوچوست و چالاکیەیە لەیاسادانان بۆ پەیوەندی نێـوان کۆمەڵگای موسڵمان و هـەموو کۆمـەڵگاکانی تـر، هـەروەکو لـەو باسـە پوختەیـەدا بینیت، کەلـەکتێبی (زاد المعـاد)دا، هێنامانـەوە. ئـەم رێـك وپێکی و چوستیە لەسەر ئـەوە وەسـتاوە کەئیسـلام بـوون (مـل کـەچی و خۆبەدەسـتەوەدان) بـۆ خـوای گـەورە بنـەڕەتێکی جیهانییـە کەپێویسـتە مرۆڤایەتی بگەڕێتەوە بۆی، یاخود پێویستە لەسەری بەگشتی بەرامبەر بەم راستییە بـێ لایـەن بوەسـتێت و زیـانی پـێ نەگەیـەنێت و بـەهیچ جـۆرە بەربەسـتێك لەشـێوەی رژێمـی سیاسـی یـان هـێزی مـاددی رێگـە لەبانگەوازەکەی نەگرێت ، دەبێت لێ بگەڕێت هەموو کەسـێك ئـەو پـەڕی سەربەخۆیی هەبێت لەم بارەیەوە، جا موسڵمان بێت یـان نـا!، بـەڵام نـابێ کەس بەرگری لەبڵاو بوونەوەی ئیسلام بکـا یـاخود بەربـەرەکانێ ی بکـا و لەگەڵیدا بجەنگێ! ئەگەر کەسێ ئـەوەی کـرد، ئەوکاتـە پێویسـتە ئیسـلام شەڕی لەگەڵدا بکات، تاکو دەیکوژێ یاخود مل کەچ دەبێ. !

***

ئەوانەی گیان و هۆشـیان بـەزیوە و روخـاون کـاتێ دەربـارەی (جیـهاد لەئیسـلام) دا دەنووسـن بـۆ ئـەوەی ئـەو تۆمەتـە لەسـەر ئیسـلام لادەن، تێکەڵیەك دەکـەن لـەنێوان پـەیڕەوی ئـەم ئاینـە کـاتێ رازی نـابێ و زۆر بەناشیرینی دادەنێت خەڵك بەزۆرلێ کردن بهێنرێتە سەر بیروباوەڕ لەلایەك، لەگەڵ پەیڕەوەکەی لەلایـەکی تـر کـە هـەوڵ دەدات بـۆ تێـك شـکاندن و روخاندنی ئەو هێزە سیاسییە ماددییانەی کەدەبنە بەربەست لەنێوان خەڵك و ئەم ئاینەدا و خەڵك دەکەنە بەندەی خـەڵکی تـر و بەندایـەتی کـردن بـۆ خوایان لێ قەدەغە دەکەن.. ئەم دوو پەیڕەوەش هیچ پەیوەندییان بەیەکەوە نییە و جێگای ئەوە نییە خەڵك تێکەڵ بەیەکیان بکەن.. ئەم جۆرە کەسانە لەبەر ئەم تێکەڵ کردنە بەر لەمەش بەهۆی روخانیـان! دەیانـەوێ جیـهاد لەئیسلامدا تەنگ بکەنەوە و لـەو چـوار چێـوەی کـە ئیمـڕۆ ناویـان نـاوە (شەڕی بەرگری کـردن) تێپـەڕی نەکـەن.. کـەچی جیـهاد لەئیسـلامدا شتێکی ترە و هیچ پەیوەندی بەو جەنگانەی لەناوخەڵکدا روودەدات و بـەو هۆیانەی کەدەبنە هەڵگیرساندن و رێ خۆشکردنیەوە نییە.. بۆیە پێویسـتە هۆیەکانی بەر پابوونی جیهاد لەئیسلامدا لەسروشتی ئیسلام خـۆی و لـەو ئەرکەی کەلەسەر رووی زەمین دەیگێڕێت تێبینی بکەین، هـەروەکو خـوای گەورە باسی کردووە، هـەروەها لـەو ئامانجـە مەزنانـەی کـەخوای گـەورە بڕیاری لەسەرداوە کەلەپێناوی ئەم ئامانجانەدا ئەو پێغەمبەرەی بەو پەیامە ناردووە و کردوویـەتی بـەدوا هـەمینی پێغەمبـەران و پەیامەکەشـی دواهەمینی پەیامەکان.

ئەم ئاینە راگەیاندنێکی گشتییە بۆ رزگار کردنی (مرۆڤ) لەسەر رووی (زەمین)، لەبەندایەتی بـەندە ـــ هـەروەها لەبەندایـەتی هـەواو هـەوەس چونکە ئەویش جۆرێکــە لـەجۆرەکانی بەندایـەتی بـۆ بـەندە ـــ ئەمــەش بەراگەیاندنی خوایەتی و پەروەردگاریـەتی خـوای گـەورە و بەتەنیایـە، بـۆ هەموو جیهان..! چونکە راگەیاندنی پەروەردگاریێتی خوای گەورە بۆ جیهان مانـای شۆڕشـێکی گشـتییە بەســەر فــەرمانڕەوایی و دەســەلاتداریەتی ئـادەمیزادان، بەهــەموو شـێوە و رژێــم و جــۆر و بارەکــانی ، مانــای هەلگەڕانــەوەی تـەواوە لەســەر هــەموو دانـانێك لەســەر رووی زەمــین، کەفـەرمانڕەوایی تێیـدا لەدەسـت ئــادەمیزاد بێــتن بەهــەر شــێوەیەك لەشێوەکانی.. یاخود بەدەربڕینێکی تر کەخوایــەتی بـۆ ئـادەمیزاد بێـت!، چونکە ئەو فەرمانڕەواییەی کــە هەلسـورانی کاروبارەکـەی بـۆ ئـادەمیزاد دەگەڕێتەوە و سەرچاوەی دەسەلاتداری لــەژێر چنگـی ئـادەمیزادا دەبێـت، لەراستیدا ئەوە بەخوا کردنی ئادەمیزادە بەجۆرێك کەهەندێکیان لـەجیاتی خوای گەورە دەبنە پــەروەردگاری هـەندێکی تـر. ئـەم راگەیاندنـە مانـای لەدەست دەرهێنانی دەسەلاتی خوایە لەدەست ئەوانەی کە داگیریان کردووە و گەڕاندنەوەیەتی بۆ خوای گەورە و دەرکردنی ئەو کەسانەیە کــە داگیریـان کردووە، ئەوانەی فەرمانڕەوایــەتی خـەلك دەکـەن بـەو یاسـا و رێبازانـەی لەخۆیانــەوە هێناویانــە، خۆیـان کردووتــە پــەروەدگار بەســەر خــەلکدا و خەلکیش بوونەتە بەندەی ئەوان.. ماناکەی روخاندنی دەولەتی ئـادەمیزادە و دامەزراندنی دەولەتی خوایی یــە لەســەر رووی زەمـین، یابــە دەربڕینــی قورئانی پیرۆز:

﴿وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَهٌ وَفِي الأَرْضِ إِلَهٌ.﴾ (الزّخرف:٨٤)

واته: (هەر ئەوە لەئاسمان خوایە و هەروەها لەسەر رووی زەمینیشدا).

﴿إِنِ الحُكْمُ إِلاّ لِلّهِ أَمَرَ أَنْ لاتَعْبُدُوا إِلاّ إِيّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ القَيِّمُ.﴾ (یوسف: ٤٠).

واته:( فەرمانڕەوایی تەنیا بۆ خوایە.. فەرمانی داوە بێجگە لەو کەسی تر نەپەرستن.. ئاینی راست ئەوەیە).

﴿قُلْ يَا أَهْلَ الكِتَابِ تَعَالَوا إِلى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ.. أَلاّ نَعْبُدَ إِلاّ اللّهَ وَلا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً، وَلا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضَاً أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللّهِ. فَإِنْ تَوَلَّوا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ .﴾ (آل عمران:٦٤) واته: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەخاوەن کتێبەکان ــ جوو و دیانەکان ــ بڵێ: وەرن بۆ قسەیەك کەراست و رەوان بێت لەنێوانماندا ئەویش ئەوەیە کەبێجگە لەخوا کەسی تر نەپەرستین، وەك (زانا و رەبەن و.... هتد) و هابەشی بۆ پەیدا نەکەین، کەس لەئێمە یەکێکی تری وەك خۆی نەکابە پەروەردگار لەجیاتی خوا کەرێبازی ژیان و بیروباوەڕی خۆی لێ وەرگرێ، ئەگەر بەگوێیان نەکردی، پێیان بڵێ ئێوە شایەتی بدەن ئێمە موسڵمانین).

دەوڵەتی خوایی لەسەر رووی زەمین مانای وانییە فەرمانڕەوایی بدرێتە دەست چەند کەسێك بەخۆیان ــ کەئەوانیش پیاوی ئایینین ــ بەرێوەی ببەن، هەروەکو ئەوەی لەدەسەلاتداری کەنیسەدا هەبوو، یاخود چەند کەسێك بەناوی خواوە قسە بکەن، هەروەك ئەوەی ناسرابوو بە (ثیوکراتی) یاخود فەرمانڕەوایی خوایی پیرۆز!! بەڵکو بەوە دێتەدی کەشەریعەتی خوا

فەرمانڕەوا بێت و هەموو کاروبارێکیش بۆ ئەو بگەڕێتەوە، بەو پێ یەی کەشەریعەت بڕیاری لەسەرداوە.

دامەزراندنی دەوڵەتی خوایی لەسەر رووی زەمین و لادانی دەوڵەتی ئادەمیزاد و دەرهێنانی دەسەڵات لەچنگ ئەو بەندانەی داگیریان کردووە و گەڕاندنەوەی بۆ خوای گەورە و تاك و تەنیا.. بەرزبوونەوەی شەریعەتی خوا بەتەنیا و لادانی ئەو یاسایانەی کە ئادەمیزاد دایانناون.. ئەمانە هەموویان بەپێڕاگەیاندن و روون کردنەوە، بەتەنیا نایێنەدی چونکە ئەو زۆردارە خۆسەپێنەرانەی کە دەسەڵاتی خوایان زەوت کردووە لەسەر رووی زەمین، وا بەئاسانی بە پێڕاگەیاندن و روون کردنەوە نایێنە سەر رێ ی راست. چونکە ئەگەر ئەمە وابوایە، ئەوا رێگا بۆ پێغەمبەرانی خوا زۆر ئاسان دەبوو بۆ چەسپاندنی ئاینی خوا لەسەر رووی زەمین! بەڵام ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کەمێژووی پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لەسەر بێ ـ و مێژووی ئەم ئاینە بەدرێژایی نەوەکانی بەخۆیەوە بینیوە.

چونکە ئەم راگەیاندنە گشتییە بۆ رزگار کردن ی (مرۆڤ) لەسەر رووی زەمین لە هەموو دەسەڵاتێك بێجگە لەدەسەڵاتی خوا، ئەویش بەراگەیاندنی خوایەتی خوا بەتەنیا و پەروەردگارێتی ئەو بۆ جیهان بەتەنیا، راگەیاندنێکی تیۆری وفەلسەفی رووت نەبوو .. بەڵکو راگەیاندنێکی بزوتنەوەیی و واقیعی وئیجابی بوو.. راگەیاندنێك پێویستی بەهێنانەدییەکی کردەوەیی هەبوو لەشێوەی رژێمێك کەبەپێ ی شەریعەتی خوا فەرمانڕەوایی ئادەمیزاد بکات، بەراستی لەبەندایەتی بەندە رزگاریان بکات بۆ بەندایەتی خوای گەورەی تەنیا و بێ هاوبەش.. جا بۆیە ناچاربوو

دەبوایە شیوەی (بزوتنەوە) وەرگریـت لـەپال شـیوازی (روون کردنـەوە) دا، تاکو رووبەرووی (واقیعی) ئادەمیزاد بیت بەهەموولایەنەکانییـەوە و بـەهۆ و ئامرازەکانی بارتەقا بۆ ئەم لایەنانـە. واقیعـی ئـادەمیزادیش، دوینـی و ئیمرۆ و سبەینی، رووبەرووی ئەم ئاینە دەبیتـەوە بـەوەی کەراگـەیاندنیکی گشتییە بۆ رزگار کردنی (مرۆڤ) لەسەر رووی (زەمین) لەهەر دەسـەلاتیك جگـە لەدەسـەلاتی خـوا -ئـەویش بەدانانـەوەی بەربەسـتی بیروبـاوەری و بۆچوونی، بەربەستی ماددی و واقیعـی.. هـەروەها بەربەسـتی سیاسـی و کۆمەلایـەتی و ئـابووری و رەگـەزی و چینایـەتی، لـەپال ئـەو بەربەسـتە بیروباوەڕیی و بۆ چوونە چەوت و ناڕەوایانەی کەهەن.. جا ئەمانـە هـەموو تیکەل بەیەك دەبن و بەشیوەیەکی زۆر ئالۆز کارلیك دەکەن.

ئەگەر ( روون کردنەوە) رووبەرووی ئەو بیروباوەڕ و بۆ چوونانەبیت، ئەوا (بزوتنـەوە)ش رووبـەڕووی ئـەو بەربەسـتە مـاددی یانـەی تـر دەبیـت - لەپیشەوەی هەمووشیان دەسەلاتداری سیاسییە کە بەهۆی بیروبـاوەڕ و بـۆ چوونی رەگـەز پەرسـتی و چینایـەتی و کۆمـەلایـەتی و ئـابووری ئـالۆز و بەیـەکداچوو خـۆی راگرتـووە و وەسـتاوە   جـا ئەمانـە پیکـەوە- روون کردنەوە و بزوتنەوە- رووبەڕووی (واقیعی مرۆڤایەتی) دەبن بەگشتی، بەهۆ و ئامرازی بارتەقا[16] بۆ هەموو پیکنەرەکانی ئەم واقیعە.. ئەم دووانـە زۆر پیویستن بۆ راپەڕینی بزوتنەوەی رزگاریخوازی مرۆڤ لەسـەر رووی زەمـین.. هەموو (مرۆڤ) یـك لەسـەر هـەموو رووی (زەمـین).. ئەمـەش خـالیکی گرنگە بۆیە پیویستە جاریکی تر روونی بکەینەوە.

---

[16]-بارتەقا: متکافیء

***

ئەم ئاینە راگەیاندنیك نییە بۆ رزگار كردنی مرۆڤی عەرەبی، پـەیامیك نییە تایبەت بیـت بەعەرەب!.. چونكە باس و خواستی ئـەو: (مـرۆڤ)ە.. جۆری (مرۆڤ) .. شوینی كاركردنیشی (زەمین)ە.. هەموو رووی (زەمـین). خوای گەورەش ــ سبحانەــ تەنیا خوای عەرەب نییـە!.. هـەروەها تـەنیا هی ئەوانەش نییــە كـەبیروباوەری ئیسـلامیان هـەلگرتووە.. بـەلكو خـوا پەروەردگاری هەموو (جیهان)ە.. ئەم ئاینەش دەیەویت هەموو جیـهان بـۆ خـوای راسـتەقینەی خۆیـان بگەرینیتـەوە و لەبەندایـەتی غــەیری خـوا دەریانبێنێت. گـەورەترین بەندایـەتی -لەروانگـەی ئیسـلام- مـل كـەچی ئادەمیزادە بۆ ئـەو یاسـایانەی كەچـەند ئـادەمیزادێكی وەك خـۆی دایـان ناوە.. ئەمەیە ئەو (پەرستن)ەی كەئیسلام بێجگە لەخوا نایەوێ بـۆ كەسـی تر ئەنجام بدرێت، هەر كەسێكیش بێجگە لەخوا بـۆ یـەكێكی تـری بكـات ئەوا لە ئاین دەردەچێ، هەرچەندە بەقسەی خۆی بلێت لەئاین دەرنـەچووە. پێغەمبـەر (ﷺ) یـش بریـاری داوە كــە (شـوێن كـەوتن)ی كەسـێك لەشەریعەت و فـەرمانرەواییدا دەبێتـە (پەرسـتن) ی ئـەو كەسـە. كـەهۆی ئەمـەش بـوو جـوو و دیانـەكان بوونـە (مشـرك)، بەپێچەوانـەی ئـەوەی فەرمانیان پێ كرابوو، كەتەنیا خوا بپەرستن.

ترمذی لە (عَدْي) كوری (حاتم) دەگێرێتــەوە و دەلێـت: كـاتێ (عَـدي) بانگـەوازی پێغەمبـەر (ﷺ) ی پێگەیشـت، رای كـردە شـام و هــەلات،

خۆشی لەسەردەمی نەفامێتیدا ببووە مەسیحی،[17] جاکاتێك خوشـکەکەی و کۆمەڵێك لەقەومەکەی بەدیل گیران، پێغەمبەر (ﷺ) چاکەی لەگەڵ کردن و لێیان خۆش بوو بەوەی خوشکەکەی بەڕەڵلاکرد و هەندێك ماڵیشی دایێ، ئەویش گەڕایەوە لای براکەی خۆی و هانی داو ئیسـلامەتی لاخۆشەویست کرد، (عَديّ) هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)، و هاتنی ئـەویش بـووە جێگـەی باس و لێ دووانی خەڵك ــ عَدّي ملوانکەیەکی خاچی لـەملدابوو کەلـەزیو دروست کرابـوو ــ کـاتێ چـووە لای پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەو ئایەتـەی دەخوێندەوە﴿ إِتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَ رُهْبَانَـهُمْ أَرْبَاباً مِـنْ دُونِ اللّـهِ. ﴾ (التوبـة :٣١) واتە: (پیاوانی ئاین و رەبەنـەکانیان کردبـووە پـەروەردگاری خۆیـان لەجیاتی خوای گەورە ...) ، ( عَدّي) دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبـەری خـوا، خـۆ ئـەوان واتـە (جـوو) و (دیانـەکان) پیـاوانی ئـاینی و رەبەنـەکانیان نەدەپەرستن ، پێغەمبەریش فـەرمووی: ((بلـى إنـهم حَرّمـوا عَلَيْـهِمُ الحَـلال وأحلّوا لهمُ الحَرام، فاتَّبعوهُم، فَذلك عِبادَتهم إِيّاهُم)) (نەخێر! پیاوانی ئـاین حەڵاڵی یان لێ حەڕام دەکـردن وحـەڕامیان بـۆ حـەڵاڵ دەکـردن، (جـوو) و (دیانەکانیش) شوێنیان دەکەوتن و گوێ رایەڵیان دەکردن، ئەوەیە پەرستنی (جوو) و (دیانەکان) بۆ پیاوانی ئاینی خۆیان واتە (أحبار و رەبەنەکانیان).

لێکدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ قسەی خوا، دەقێکی روون و ئاشکرا و بڕاوەیـە لەسـەر ئـەوەی کـەگوێ رایـەڵی و شـوێن کـەوتن لەشـەریعەت و فەرمانڕەواییدا، پەرستنە و خەڵك لەئاین دەردێنێت، دەبێتە هـۆی ئـەوەی هەندێك خەڵك هەندێکی تر بکەنە پەروەردگار ... کەئەم ئاینە هاتووە بـۆ

[17]-مەسیحی:(دیان)یا(فەلە)

ئەوەی لای ببات و بیسرێتەوە و بانگی رزگارکردنی (مـرۆڤ)ی سـەر رووی (زەمین) لەبەندایەتی هەرشتێك بێجگە لەخوا، رابگەیەنێت...

شتێکی ئاساییە ئیسلام ناچاربوو دەبوایە راپەرێت لەسەر رووی (زەمین) بۆ لادانی ئەم ( واقع)ەی کەجیایە لەگەڵ راگەیاندنە گشـتییەکە.. بـەروون کردنەوە و بەبزوتنەوە پێکەوە.. بۆ ئـەوەی دەسـتی خـۆی بوەشـێنێتە ئـەو هێزە سیاسیانەی خەڵکیان کردووتە بەندەی شتی تـر بێجگـە لەشـەریعەتی خوا و دەسەڵاتی خوا -لێناگەڕێن خەڵك گوێ لەم روون کردنەوەیـە بگـرن و بەئارەزووی خۆیان ئەم بیروباوەڕە وەرگرن و هیچ دەسـەڵاتدارێکیش تخونیـان نەکـەوێت. لـەدواییدا رژێمێکـی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و رامیـاری دابمەزرێنێت، تا رێگە بەبزوتنەوەی رزگاریخوازی بدات بۆ ئـەوەی بەڕاسـتی راپەڕێت - پاش لادانـی هـێزی دەسـەڵاتدار- جـا ئـەو هـێزە چ هـێزێکی سیاسی رووت بێـت، یـا بەبـەرگی رەگـەز پەرسـتی خـۆی داپۆشـێت، یـا چینایەتی بێت بەڵام لە ناو یەك رەگەزدا بێت!

ئیسلام هەرگیز مەبەستی ئەوە نـەبووە خـەڵك بـەزۆری بهێنێتـە سـەر بیروباوەڕەکەی خۆی.. بەڵام ئیسلامیش تـەنیا بیروبـاوەڕێکی رووت نییـە. هەروەکو گوتمان ئیسلام راگەیاندنێکی گشتییە بۆ رزگـاری کردنـی مـرۆڤ لەبەندایەتی بەندە. چونکە خۆی لەسەرەتاوە مەبەستی لادانی ئـەو رژێـم و فەرمانڕەواییانە بووە کە لەسەر فەرمانڕەوایەتی ئادەمیزاد بۆ ئـادەمیزاد و بەندایەتی مرۆڤ بـۆ مـرۆڤ دامـەزراوە.. پاشـان خـەڵکی تـر بـەرەڵڵا و سەربەخۆ دەکات.. سەربەخۆییەکی تەواو - بۆ هەڵبژاردنی ئەو بیروباوەڕەی کە دەیانەوێت، بێ هیچ دەست کـارێ کـردن لـە هەڵبژاردنەکـەیان- پـاش

هەڵگرتنی ئەو پاڵپەستۆیە سیاسیەی لەسەریانە و هەروەها دوای روون کردنەوەیەکی جوان و رۆشن کەرەوە بۆ بیر و هۆش و گیانیان - بەلام ئەم تاقی کردنەوەیە مانای ئەوەنییە خەڵك هەواو ئارەزووی خۆیان! یا هەندێکیان لەجیاتی خوای گەورە هەندێکی تر بکەنە پەروەردگار!.. ئەو رژێمەی فەرمانڕەوایی مرۆڤ دەکات لەسەر رووی زەمین دەبێت لەسەر بناغەی بەندایەتی بۆ خوای تاك وتەنیا دامەزرابێت، ئەویش بەوەرگرتنی شەریعەت و پەیڕەوەکان تەنیا لەو. پاشان هەریەکێك -لەژێر سێبەری ئەم رژێمەدا - ئەو بیروباوەڕە هەڵگرێ کەخۆی دەیەوێ! بەم پێیە (ئایین پەروەری) هەموو بۆ خوا دەبێت . واتە سزا و پاداش و مل کەچی و شوێن کەوتن و بەندایەتی هەموو بۆ خوا دەبێت.. چەمك (مفهوم)ی (ئایین) سەرتاپا و گشتی ترە لە چەمکی (بیروباوەڕ) چونکە ئایین ئەو پەیڕەو و رژێمەیە کەژیان بەڕیوە دەبات، ئایین خۆی لەئیسلامدا لەسەر بناغەی بیروباوەڕ وەستاوە، بەلام بەگشتی ئایین زیاتر لەبیروباوەڕ دەگرێتەوە.. هەروەها دەکرێت لەئیسلامدا زۆر کۆمەڵەی جیاجیا مل کەچ بن بۆ پەیڕەوە گشتییەکەی، کە لەسەر بناغەی بەندایەتی بەتەنیا بۆ خوا وەستاوە، هەرچەندە هەندێك لەم کۆمەلانە بیروباوەڕی ئیسلامی هەڵنەگرن.

ئەوەی لەسروشتی ئەم ئاینە بگات - هەروەکو باسمان کرد - ئەوا بێگومان بەهەمان شێوە لەپێویستی راپەرینی بزوتنەوەیی لە ئیسلام دەگات بەشێوەی جیهاد کردن بە (شمشێر) - لەپاڵ جیهادی روون کردنەوە - و دەزانێ کەئەمە بزوتنەوەیەکی بەرگری کردن نەبوو - بەو مانا تەسکەی کەئیمڕۆ زاراوەی (جەنگی بەرگری) پێ ناسراوە، هەروەك ئەوانەی

لەژێر پاڵەپەستۆی واقیعی ئیمڕۆ و لەژێر هێرشی ڕۆژهەلآتناسە فێڵبازەکـان بەزیون بەتەمان جیهادی ئیسلامی پێ نیشان بدەن ــ بەڵکو بزوتنەوەیـەکی تەکاندان و ڕاپەڕین بوو بۆرزگار کردنی (مرۆڤ) لەسـەر ڕووی (زەمـین)،..
بەهۆو ئامرازی بارتەقا بۆ هەموو لایەنەکانی واقیعی ئادەمیزادی، بەچـەند قۆناغێکی دیاری کراو، بۆ هەر قۆناغێکیش هۆی بەردەوام و نوێ بووەوەی خۆی هەبێت.

ئەگەر شیاو نەبێت تاکو بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی بەبزوتنەوەیـەکی بەرگری کردن ناونەبـەین، لـێرەدا پێویسـتە مەفـهومی ووشـەی (بـەرگری کردن) بگۆڕێن و بیکەین بە (بەرگری لـەمرۆڤ) خـۆی، دژی هـەموو ئـەو هۆیانەی کە سەربەخۆییەکەی بەند دەکەن و ڕێگە لـەڕزگار بوونـی دەگـرن ... ئەو هۆیانەش بریتین لە چەند بیرو بـاوەڕو بۆچونێـك، هـەروەك بریتـین لەچەند ڕژێمی سیاسی کە لەسەر چەند بەربەستێکی ئابووری و چینایەتی و ڕەگەز پەرستی وەستاون، کەلەکاتی هاتنی ئیسلام بۆ سەر ڕووی زەمین لـە ئارادا بوون، هەندێکیان تائیستاش لەناو نـەفامێتی ئیمـڕۆدا لـە هـەندێك شوێندا لە ئارادان.!

بەم فراوانییە لەمەفهوومی ووشەی (بەرگری کردن) دەتوانین حەقیقـەتی هاندەرەکانی ڕاپەڕینی ئیسلامی لەسەر ڕووی (زەمین) بـە شـێوەی جیـهاد کردن تێبینی بکەین ، هـەروەها سروشـتی ئیسـلامیش تێبینـی بکـەین ، کەبریتییە لەڕاگەیاندنێکی گشتی بـۆ ڕزگـار کردنـی مـرۆڤ لەبەندایـەتی بەندە و بڕیاردانی خوایەتی خوای گەورە و تـاك و تـەنیا و پـەروەردگارێتی ئەو بۆ هەموو جیهان و ڕوخاندنی دەوڵەتی هـەوا و ئـارەزوی ئـادەمیزادی

لەسەر رووی زەمین و دامـــەزراندنی دەولـّەتی شـەریعەتی خـوا لەجیـهانی مرۆڤدا.

کەچی هەولّدان بـۆ پـەیداکردنی بیـانووی بـەرگری کـردن بـۆ جیـهادی ئیسلامی، بەو مانا تەسکەی کە ئیمرۆ بۆ جەنگی بەرگری کردن بەکاردێت و هەولّدان بۆ گەڕان بـەدوای چـەند بەلّگەیـەك بـۆ سـەلماندنی ئـەوەی کـە رووداوەکانی جیهادی ئیسلامی تەنیا بۆ بەرپەرچ دانـــەوەی دەسـت درێـژی هێزەکانی دراوسێ بووە بۆ سەر (نیشتمانی ئیسلامی) ـ کـە ئـەمیش لای هەندێکیان تەنیا دوورگەی عەرەبە ـ ئەم هەولّدانـە نیشـانەی کـەم زانییـە لەسروشتی ئەم ئاینەو سروشتی ئەو دەورەی کەبۆی هاتووە تا لە سەر رووی زەمیندا پیّ ی هەستیّ. هەروەها نیشـانەی بـەزین و راکردنـە لەبەرامبـەر پالّەپەستۆی واقیعی ئیمرۆ و پالّەپەستۆی هێرشی رۆژهەلاّتناسیەوە بۆ سەر جیهادی ئیسلامی!

داخۆ ئەبو بەکرو عومـەرو عوسمـان ـ خـوا لێیـان رازی بێـت ـ ئەگـەر دلّنیابوونایـە لەدەسـت درێـژی و هێرشـی رۆمـەکان و فارسـەکان بۆسـەر دوورگەی عەرەب ، ئایا لەپالّنان و هەلّکشانی ئیسلامی بۆ سەر بەشەکانی تری سەر رووی زەمین رادەوەستان؟ لە کاتێك کە لە پێش بانگەوازەکـەیاندا ئەم هەموو بەربەستە ماددییانە هەبێت، کە بریتین لە رژێمە سیاسییەکانی دەولّەت و رژێمە رەگەز پەرست و چینایەتییەکانی کۆمەلّگا و ئــەو رژێمـە ئابووریانەی کە لەئاکامی رژێمە رەگەز پەرسـتە چینایەتییەکانـەوە پـەیدا بوون، کە لەلایەن هێزی ماددی دەولّەتەوە پارێزگاریان لێدەکرێت؟.!

ساویلکەییە مرۆڤ بیر لەبانگەوازێك بکاتەوە کەدەیــەوێت رزگــارکردنی (مرۆڤ) رابگەیــەنێت ‹‹‹ هــەموو مــرۆڤ ‹‹‹ لەســەر رووی (زەمــین) هــەموو رووی زەمــین ››، پاشــان لــە ڕووی ئــەم بەربەســتانە دەستەوســان بووەستێت و تەنیا بەقسەو زوبان جیهادیان لەگەڵ بکات! ‹‹‹ بەڵێ بەقسەو بەڕوون کردنەوە جیهادیان لەگەڵدا دەکات، کــاتێ ئــەم بەربەســتانە ڕێگــە لەنێوان بانگەوازەکە و خەڵکدا چۆڵ دەکەن بۆ ئەوەی بەسەربەستی بتوانێت لەگەڵیاندا بدوێت، لەکاتێکدا خەڵك لەم هەموو کارتێکەرانە رزگــار بــوون ‹‹‹ جالێرەدا ﴿لاإكراه في الدّين.﴾ (البقرة:٢٥٦) واتە: (ئــاین بــەزۆر قبــوڵ کردنی تێدا نییە) ‹‹‹ بەڵام کاتێ ئەم بەربەستانە و کارتێکــەرە ماددییانــە هەبن، پێویستە یەکەم جار ئەم بەربەستانە بــەزەبری هــێز لابــبردرێن تــاکو بتوانرێ دڵ و گیانی مرۆڤ بدوێنرێ لەو کاتەی مرۆڤ لەم هــەموو کــۆت و زنجیرانە ئازادبووە!

جیهاد کردن زۆر پێویستە بۆ ئەم بانگەوازە، ئەگەر هاتوو ئامانجــەکانی بانگەواز بریتی بێت لە ڕاگەیاندنی رزگــار کردنــی مــرۆڤ، راگــەیاندنێکی راستەقینە کە رووبەڕووی واقیعێکی راســتەقینەدا بێــت بــەهۆ و ئــامرازی بارتەقا بــۆ هــەموو لایەنــەکانی ئــەم واقیعــە و تــەنیا بــەڕوون کردنــەوەی فەلسەفی نەزەری رازی نەبێت! جا ئەگەر هــاتوو نیشــتمانی ئیســلامی یــا بەدەر بڕینێکی ئیسلامی (دار الإسلام) لە هەڕەشەی دراوسێ یەکانی دڵنیا بێت، یا لەحاڵەتی مەترسیدا بێت.. ئیسلام کاتێ بۆ ئاشتی تێدەکۆشێت و هەوڵی بۆدەدات، مەبەستی ئەو ئاشتییە نزم و هەرزانــە نییــە کەدەیــەوێت تــەنیا ئــەو خاکــە تایبەتییــە بپــارێزێت و دڵنیــا بکــات کــە خەڵکەکــەی

بیروباوەڕی ئیسلامییان هەڵگرتووە، بەڵکو ئەو ئاشتییەی دەوێت کە تێیدا ئاین پەروەری تەنیا بۆ خوا بێت، واتە بەندایەتی خەڵك هەمووی تەنیا بۆ خوا بێت، ئەو بەندایەتیەی کەهەندێك تێیدا دەبنە پەروەردگاری هەندێکی تری تێدا نەبێت.

پەند وەرگرتنیش بەکۆتایی ئەو قۆناغانەیە کەبزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی ـ بەفەرمانی خوا ـ بڕیویەتی نەك بەڕۆژانی سەرەتایی ئەم بانگەوازە یاخود بە رۆژانی ناوەڕاستی ... ئەم قۆناغە هەروەکو ئیمام (ابن القیم) دەڵێ دوایی هات لەدوای هاتنە خوارەوەی سوورەتی (براءة) کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بوونە سێ بەش : بەشێك شەڕیان لەگەڵ دەکرد، بەشەکەی تر پەیمانیان لەگەڵدا هەبوو، لەگەڵ خەڵکی لەئەستۆ ... پاشان ئەو بەشەی پەیمان و ئاشتی ویستنیان لەگەڵدا هەبوو موسڵمان بوون ... مانەوە دوو بەش: شەڕکەر لەگەڵیدا و خەڵکی لەئەستۆ، ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ دەکرد لەهەمان کاتیشدا لێی دەترسان ... ئینجا خەڵکی سەر رووی زەمین لەگەڵیدا بوونە سێ بەش ، بەشێکیان موسڵمانن و باوەڕیان پێی هێناوە، بەشەکەی تر بێ لایەنەو جێگەی مەترسی نییە (ئەوانەش خەڵکی لەئەستۆن هەروەکو لە رستەکەی پێشوو تێگەیشتین). بەشی سێیەم: لێی دەترسێ و شەڕی لەگەڵ دەکات

ئەمە هەڵوێستی راستەقینە و مەنتیقییە لەگەڵ سروشتی ئەم ئاینە و ئامانجەکانیدا دەگونجێت، نەك تێگەیشتنی ئەوانەی لەژێر پاڵەپەستۆی ئەم واقیعە و لەژێر هێرشی رۆژهەلاتناسە فیلبازەکاندا بەزیون!

خوای گــەورە موسـڵمانەکانی لــە مەککــەدا لەشــەڕ کــردن پاراســت ، هەروەها لەسەرەتای کۆچ کردنیــش بــۆ مەدینــە بەموســڵمانەکان دەگوتــرا ﴿ ... كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيْمُواْ الصَّلاَةَ وَآتــوا الزَّكَـاةَ ... ﴾(النسـاء :٧٧) واتــە: (دەست بپارێزن و نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن) ... پاشــان ڕێگــەیان پــێ درا وپێیان گوترا ﴿ أُذِنَ لِلَّذِيْنَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيْـرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِنْ دِيارِهِمْ بِغَيْرِ حَقّ إِلّا أَنْ يَقُولُـواْ: رَبُّنَـا اللهُ وَلَـوْلا دَفْـعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَـوَاتٌ وَمَسَـاجِدُ يُذْكَـرُ فِيـهَا اسْمُ اللهِ كَثِـيراً، وَلَيَنْصُـرَنَّ اللهُ مَـنْ يَنْصُـرُهُ إِنَّ اللهَ لَقَـوِيٌّ عَزِيـزٌ، أَلَّذِيــنَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ وَأَمَرُواْ بِالْمَعْرُوْفِ وَنَهَواْ عَــنِ الْمُنْكَرِ، وَللهِ عَاقِبَةُ الأُمُوْرِ. ﴾ (سورة الحج:٣٨-٤١).

واتە: (ڕێگە دراوە بەو کەسانەی زوڵمیان لیٚ کــراوە شــەڕبکەن خــواش بەتوانایە لەسەرخستنیان بەسەر دوژمنەکانیان، ئەوانەی لەشــوێنی خۆیــان دەرکراون بەناهەق، تەنیا لەبەر ئــەوەی دەڵێــن پــەروەردگاری ئێمــە خوایــە (الله) ئەگەر خوای گەورە خەڵکی هەندێك بەهەندێکی تــر لانــەبات ـ وەك لادانی کافرەکان بەموسڵمانەکان ... ئەوا (صوامــع) کەشــوێنی پەرســتنی ڕەبەنەکانە، (بیع) کــە شنوێنی پەرســتنی دیانەکانــە بــەڵام گــەورەترە لــە (صوامع) ، (صلوات) کــە پەرســتگای جوولەکەکانــە و مزگەوتــەکان کــە شوێنی خواپەرستییە لەلایەن موسڵمانەکان کەناوی خوای تێدا دەهێــنرێ و جێگای خوا پەرستنە،ئەوا ئەو شوێنانە هەمووی تێك دەچوون، خواش ئــەو کەسانە سەردەخا کەیارمەتی خــوا دەدەن،خــوا بــەهێز و توانایــە و کــەس ناتوانێ فەرمانی ئەو ڕاوەستێنێ،ئەو کەسانەی ئەگەر حوکمیان دانەدەســت

ئەمر دەکەن بەنوێژکردن و زەکات دەدەن و فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە دەکەن، هەموو کار و بارێکیش لە کۆتاییدا بۆ خوا دەگەڕێتەوە)... پاشان شەڕیان لەسەر فەرز کرا لەگەڵ ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ دەکەن، نەك ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ نەکردوون، پـێ یـان گوتـرا ﴿وَقَـاتِلُواْ فِـي سَـبِيلِ اللهِ الَّذِيـنَ يُقَاتِلُونَكُمْ.﴾ (البقرة:١٩٠) واتە (شەڕ بکەن لەپێناوی خوا لەگەڵ ئەوانـەی شەڕتان لەگەڵ دەکەن)... دوایی شەڕیان لەسەر فـەرز کـرا لەگـەڵ هـەموو (مشرك)ەکان، پێیان گوترا ﴿وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِيْنَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُوَنُكُمْ كَآفَّةً.﴾ (التوبة: ٣٦) واتە: (هەموو (مشرك)ەکان بکوژن، هەروەکو ئەوان هەموتان دەکوژن)... پێیان گوترا ﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُـونَ بِـاللهِ وَلا بِـالْيَوْمِ الآخِـرِ وَلايُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللهُ وَ رَسُولُهُ وَلا يَدِينُـونَ دِيـنَ الْحَـقِّ مِـنَ الَّذِيـنَ أُوتُـواْ الكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الجِزيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ.﴾ (التوبة:٢٩) واتە: (شەڕ بکەن لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان بەخوا و بە ڕۆژی دوایی نییە و ئەوشتەی کـە خـوا و پێغەمبـەر (ﷺ) حـەرامیان کـردووە ئـەوان حـەرامی ناکـەن و بەقەدەغەی نازانن، ئاینی ڕاستی کەئیسلامە ئەوان مـل کـەچ نـین بـۆی ، لەوانەی کتێبیان بۆ هاتۆتە خوارەوە تـاکو سـەرانە دەدەن کـە لـەتوانایاندا هەیە و بەسەر شۆڕی دێنە ژێر باڵی دەوڵەتی ئیسلامی).

کەواتە شەڕکردن ـ هەروەکو ئیمام (ابن القيِّم) دەڵێ: (یەکەم جار حەڕام بوو، دوایی ڕێگەی پێدرا، پاشان فەرمانی پێدرا لەگەڵ ئەوانـەی دەسـتیان بەشەڕکردووە شەڕبکات، پاشان فەرمانی پێـدرا لەگـەڵ هـەموو (مشـرك) ەکان شەڕ بکات).

جدییەت و چوستی و بەپەرۆشی دەقەکانی قورئـان کـەدەربارەی جیـهاد دەدوێن و بەپەرۆشی ئەو فەرمووودانەی کە مرۆڤ هـان دەدەن بـۆ جیـهاد و بەپەرۆشـی و چوسـتی ئـەو رووداوە جیهادیانـەی لەسـەرەتای ئیسـلام و بەدرێژایی مێژووەکەی روویانداوە لێناگـەڕێت لێکدانـەوەی ئەوکەسـانە بـۆ جیهادی ئیسلامی بچێتە دڵی مرۆڤـەوە کـە لـەژێر پاڵەپەسـتۆی واقیعـی ئیمڕۆ و لەژێر هێرشی رۆژهەلاتناسە فێڵبازەکاندا بەزیون!

کێ هەیە فەرموودەی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەیەوە ببیستێت و بەدوای رووداوەکانی جیهادی ئیسلامی بگەڕێت و پاشان واتێ بگات ئەمە شـتێکی کاتییـە و دێ و دەڕوات و بـەم هـات وچوونـە بەسـتراوەتەوە و لەسنووری بەرگری کردن بۆ دڵنیا کردنی سنورەکان دەوەستێت؟!

خوای گەورە هەریەکەم جار لـەو ئایەتانـەی کـە ناردییـە خـوارەوە بـۆ موسڵمانانی روونی کردەوە کە حاڵەتی سەرەکی و بەردەوام لەسروشتی ژیانی دنیـادا ئەوەیـە کـە هـەندێك خـەڵك بەهـەندێکی تـر لابـدات، بۆئـەوەی خراپەکاری لەسەر رووی زەمین لابدات ﴿ أُذِنَ لِلَّذِيْـنَ يُقَـاتَلُونَ بِأَنَّـهُمْ ظُلِمُـواْ وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيْرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُـواْ مِـنْ دِيَـارِهِمْ بِغَـيْرِ حَـقٍّ إِلاَّ أَنْ يَقُولُواْ: رَبُّنَا اللهُ وَلَوْلا دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِـعُ وَبِيَـعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللهِ كَثِيراً .... ﴾ (الحج:٣٩) ئـەم ئایەتانـە لەمەوبەر تەفسیر کراون ، کەواتە ئەمە حاڵەتێکی بەردەوامە و کاتی نییە، حاڵەتی بەردەوام ئەوەیە کە هەق و ناهەق (ڕاستی و ناڕەوایی) لەسەر رووی زەمین ناتوانن پێکەوە بژین. هەرکاتێ ئیسلام دەستی کـرد بـە راگەیاندنـە گشتییەکەی بۆ دامەزراندنی پەروەردگاریتی خوای گەورە بۆ هەموو جیهان

و ڕزگار کردنی مرۆڤ لەبەندایەتی بەندە، دەبینین ئەوانــەی کـە دەسـەڵاتی خوایان لەسەر رووی زەمین داگیر کردووە بەگژیدا دەچن و هەرگیز لەگـەڵیدا ئاشت نابن و پێك نایەن، ئیسلامیش بەهەمان شێوە رادەپەڕێ بـۆ ئـەوەی بیان روخێنێ و خەڵکی لە ژێر دەسەڵاتی ئەوان دەربهێنێ و (مرۆڤ)ی سەر رووی زەمین کەبەدەستی ئەم دەسەڵاتدارە زەوت کەرانــە گیریـان خـواردووە رزگار بکات ... ئەمەش حاڵـەتێکی بەردەوامــە کـە لەگـەڵیدا راپـەڕینی جیهادی رزگاری خواز راناوەستێت، تاکو ئاین پەروەری هــەمووی بـۆ خـوا دەبێت.

دەسـت هــەڵگرتن لەشـەڕ لەمەککـە تـەنیا بریتـی بـوو لـــەقۆناغێك لەپلانێکی دوورو درێژدا، هەروەها ئەمە بەنیسبەت سەرەتای کۆچ کردنیش وابوو. ئەوەی بووە هۆی هاندانی موسڵمانەکان پاش سـەردەمی راپـەڕین و دەرچـوون پاراسـتنی شـاری مەدینـە نـەبوو... بـەڵکو ئەمـە ئامـانجێکی سەرەتایی و پێویست بوو، ئامانجی کۆتـایی نـەبوو... بـەڵکو ئامانجێکـە هۆیەکانی راپەڕینی دابـین دەکـات، دڵنیـایی لەبنکـەی راپـەڕین دەکـات، راپەڕینی رزگار کردنی (مرۆڤ) و لادانــی ئـەو بەربەسـتانەی کەرێگـە لـە راپەڕینی خودی (مرۆڤ) دەگرن!.

دەست هەڵگرتنی موسڵمانان لە جیهاد کردن لەمەککەدا شـتێکی روون و ئاشـکرایە، چونکـە بانگـەوازی ئیسـلامی لەمەککــەدا سـەربەخۆیی راگەیاندنی پێ درابوو... خاوەنی بانگەوازەکە کە پێغەمبــەر بـوو (ﷺ) بنەماڵەی هاشمی لەپشت بوو، کە ئەوانیش پارێزگاریان لێ دەکرد و ئەویش بانگەوازی ئاشکرا دەکرد، لەگـەڵ دڵ و گیانیـان دەدوا و لەهـەمان کـاتدا

خەڵكی تریشی دەبینی ... هیچ جۆرە دەسەڵاتێكی سیاسی ڕێكخراوەیی ئەوتۆ نەبوو كە ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بانگەوازەكە بگرێ، یا ڕێگەی خەڵك بگرێ لەبیستنی ئەم بانگەوازە! هەر بۆیە بەكار هێنانی هێز ـ لەم قۆناغەدا ـ هیچ پێویست نەبوو، یاخود لەبەر چەند هۆیەكی تر كە ڕەنگ بێ لەم قۆناغەدا هەبووبێت، هەروەكو لە (في ظلال القرآن) دا لەكاتی تەفسیركردنی ئەو ئایەتەی كە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ: كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ ...﴾ (النّساء:٧٧) لەسوورەتی (النساء) دا پوختە و كورتم كردۆتەوە قەیدی ناكات ئەگەر لێرە بەشێك لەم پوختەیە بۆ سەلماندن بێنینەوە:ـ

(لەوانەیە دەست هەڵگرتن لەشەڕ لەمەككەدا، لەبەر ئەوە قەدەغەكرابێ چونكە سەردەمی مەككە سەردەمی پەروەردەكردن و ئامادە كردن بووە، لەشوێنەوارێكی دیاری كراو بۆ كۆمەڵێكی دیاری كراو و لەناو بارو دۆخێكی دیاری كراودا، لەئامانجەكانی پەروەردەكردن و ئامادە كردن لەشوێنەواری تایبەتی وادا پەروەردەكردنی نەفس و دەروونی تاكی عەرەبی بوو لەسەر خۆڕاگرتن لەبەرامبەر ئەو شتانەی كە عادەت وایە خۆی لەبەر ڕاناگرێت، وەك خۆڕاگرتن لەسەر زوڵم لێكران لیʼ ی ، یان لەوانەی لە ژێر باڵی دان و لەپەنای ئەودان، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕزگار بێت لەكەسایەتی خۆی، خۆی لە خودی خۆی داماڵێ و یەك لا كاتەوە، تاكو نەخۆی و نە ئەو كەسانەی پەنایان بردۆتە بەرئەو لە پێش چاویدا ببنە خولگەی ژیانی و پاڵنەری جولانەوەی لە ژیاندا. هەروەها پەروەردەكردنی لەسەر ڕاگرتنی دەمار گیری خۆی، نەوەك بە یەكەم كارتێ كردن هەڵبچێ ـ وەكو سروشتی

ئەو وایە ـ و بەیەکەم وروژێنەر بوروژێ ، تاکو سروشتی و بزوتنەوەکەی بەتەواوی رێك و پێك دەبێت -- پەروەردەکردنی بۆ ئەوەی بە دوای کۆمەڵگایەکی رێکخراو بکەوێت کە سەرکردایەتییەکی هەیە، دەبێ لە هەموو کار و بارێکی ژیانیدا بۆی بگەڕێتەوە، دەستی خۆی ناوێتە ناو ئیش وکارەوە تەنیا بەپێ ی ئەوەی سەرکردایەتی فەرمانی پێدەدات ـ هەرچەندە ئەمە لەگەڵ نەریت و ڕاهاتنی ئەو جیاواز بێت ـ کە ئەمەش بەردی بناغەی ئامادەکردنی کەسایەتی عەرەبی بوو، بۆ داهێنانی (کۆمەڵگایەکی موسڵمان) کە مل کەچ بێت بۆ سەرکردایەتییەکی ئاراستەکەر، کۆمەڵگایەکی گەشەکردووی پێشکەوتوو، نەك کۆمەڵگایەکی بێ سەر و بەر یاخود ئاژەڵی.!

(لەوانەیە دەست هەڵگرتن لەشەڕ لەبەر ئەمەبێت چونکە بانگەواز بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە زیاتر کاریگەر تر بێت و بچێتە ناو دڵی خەڵکەوە، لەشوێنەوارێك وەکو ئەوەی قورەیش تێیدا دەژیا کە پڕبوو لە کەللە رەقی و سەرسەختی ، لەوانەیە شەڕکردن لەگەڵیدا ـ لەم قۆناغەدا ـ ببوایە هۆی زیاد بوونی سەرپێچی و کەللە رەقی و پەیدا بوونی تۆڵەسەندنەوەی خوێناوی نوێ، وەکو ئەو تۆڵەسەندنەوانەی عەرەبەکانی پێش ئیسلام ناسیبوویان ؛ کە بووە هۆی روودانی جەنگی (داحیس و غەبرا) و جەنگی (بەسوس) کە ئەمانەش چەندەها ساڵیان خایاند ، کە زۆر لەهۆزە عەرەبەکانی تێدا بەتەواوی لەناو چوون، نەوەك ئەم تۆڵەسەندنەوە نوێیانە لە مێشك و بیرەوەرییاندا بەندبێت بەهاتنی ئیسلام ئیتر هەرگیز دانەمرکێتەوە ، ئیسلامیش کە وەك بانگەواز و ئاینێك هاتۆتە خوارەوە

تەنها ببێتە مەسەلەی تۆڵەسەندنەوە و ڕکابەرییەکی نەفامی و ئاراستە سەرەکییەکانی خۆی لەبیربچێتەوە، کە خۆشی تازە لەسەرەتای چەکەرەکردن و بڵاو بوونەوەیەتی، ئیتر هەرگیز بەیەکجاری بزربێت و باسیش نەکرێت!

(لەوانەشە لەمەترسی ئەوەی نەوەك شەڕو کوشتار لە هەموو ماڵێك روو بدات. چونکە لەو کاتەدا بەشێوەیەکی گشتی دەسەڵاتدارییەکی نیزامی نەبوو تاکو موسڵمانەکان ئازار بدات و وایان لیٚ بکات واز لەئیسلام بێنن و پەشیمان ببنەوە، بەڵکو ئەم ئیشە درابووە دەست ئەو کەسانەی جڵەوی کاریان بەدەست بوو، تاکو ئەو کەسەی موسڵمان بێت ئازاری بدەن و پەشیمانی کەنەوە و (تەمبیٚ ی کەن) ،جا ڕێگە دان بەشەڕکردن لەشوێنەوارێکی وادا ـ مانای شەڕ و کوشتارە لەهەموو ماڵێکدا. پاشان دەگوترێت ئا ئەمەیە ئیسلام! خۆ ئەوان ئەو قسەیان دەکرد کە هێشتا ئیسلام فەرمانی بە شەڕکردن نەدابوو! جا ئەگەر فەرمانی دابوا دەبوایە چی بڵێن!!، چونکە پڕوپاگەندەی قوڕەیش لەوەرزی حەج کردن لەناو عەرەبەکان کە دەهاتن بۆ حەج و بازرگانی، دەورێکی گرنگی هەبوو، کە رای دەگەیاند: موحەممەد، باوك و کوڕ لەیەك جیا دەکاتەوە، بێجگە لە جیاکردنەوەی لەهۆز و خێڵەکەی! جا چۆن دەبوو ئەگەر بهاتایە فەرمانی بدایە کوڕ باوکی خۆی و بەندە خاوەنەکەی خۆی بکوژیٚ؟ ئەمەش لەناو هەموو ماڵ و گەڕەکێك رووی بدایە؟!

(یا لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆی دەیزانی رۆژێك دادێت زۆربەی ئەوانەی رق ئەستوور و لامل بوون بەرامبەر بە ئیسلام و هەمیشە خەریکی ئەوە بوون ئەو موسڵمانانەی کە زوو ئیسلام ببوون، پەشیمانیان

بکەنەوە و ئازار و ئەشکەنجەیان بـدەن! خۆیـان دێـن و دەبنـە سـەربازێکی دڵسۆز بۆ ئەم ئیسلامە، بگرە دەبنە یەکێك لە سەرکردەکانیشـی ... ئایـا عومەری کوڕی خەتتاب یەکێك نەبوو لەوانە ؟!

(لەوانەشە چونکە خووڕەوشت و سروشتی عەرەبەکان لە شـوێنەوارێکی وەکو مەککە وابووە، کە هەر کاتێك زۆر لێ کراوێکیان ببینیبوایە یەکسەر دەووروژان و هـەڵدەچوون ، تـاکو رزگاریـان نەکردبایـە وازیـان نـەدەهێنا! بەتایبەتی ئەگەر زوڵم و ستەمەکە لە ناویاندا لە پیاوێکی خانەدان و پیـاو ماقوڵ بکرابووایە ... زۆر روداو هەیە کەراستی ئەم رایە ـ لەم شـوێنەوارە ـ پیشـان دەدات ، بـۆ نموونـە (ابـن الدغنـة) رازی نـەبوو بـەوەی واز لـە ئەبوبەکر ـ کە پیاوێکی نان دەربوو ـ بێنێ تـاکو کـۆچ بکـاو لـە مەککـە دەربچێت، ئەمەی بە شورەیی دەزانی بۆ عەرەب! لەبەر ئەوە داوای لێ کرد بچێتە پەنای ئەو و خۆی بەو بپارێزێ ... دوا ڕوداویـش هەڵوەشـاندنەوە و دڕاندنی لاپەڕەی گەمارۆدان (صحيفة الحصار) ی نەوەی هاشم بوو لە دۆڵی ئەبو تالیب، پاش ئەوەی نەوەی هاشم ناڕەحەتی و برسێتییەکی زۆریان لـەم دۆڵەدا کێشـا ... کـەچی لـە شـوێنەوارێکی تـری وەکـو شـوێنەوارەکانی (شارستانێتی کۆن) کە لەسەر زەلیلـی و سەرشـۆڕی راهـاتبوون، لەوانەیـە خۆکڕکردن لەسەر ئازار ببوایە مایـەی گاڵتـە پـێ کـران و بەکـەم زانـین و شکاندنەوە، بگرە زیاتر رێزنان لە پیاوە ستەمکار و دەست درێژ کەرەکان.

(لەوانەشە ئەمە وابووە دیسان لەبەر کەمی ژمارەی موسڵمانەکان لـەم کاتەدا و کۆبوونەوەیان لەمەککە چونکە بانگەوازەکە هێشتا نەگەیشـتبووە بەشەکانی تری جەزیرە، یان ئەوەتە بەپەرت و بڵاوی گەیشتبووە ناویان، جا

لەکاتی وادا خێڵەکان لەشەڕی ناو خۆیی نێــوان قورەیـش و ڕۆڵـەکانی بـێ لایەن دەبوون، تاکو بزانن چارەنووسی شەڕەکە چۆن دەبێت... چونکــە لـەم جۆرە بارودۆخـەدا لەوانەیـە شـەڕەکە بـە کوژرانـی کۆمەڵـە موسـڵمانەکە کەژمارەیان کەم بوو کۆتـایی بێـت، هەرچـەندەموسـڵمانەکان چـەند جـار بەقەدەر ژمارەی خۆیان لەوان بکوژن ـ بەڵام (شرك) هەردەمێنێتەوە کـەچی کۆمەڵە موسوڵمانەکە لەناو دەچێت، جارێکی تـر لەسـەر رووی زەمـین نـە ڕژێمێکی ئیسلامی دروست دەبوو و نەقەوارەیەکی واقیعیشیان بـۆ دەبـوو، ئیسلامیش خۆی ئاینێکە هاتووە بۆ ئەوەی ببێتە پـەیڕەوی ژیـان و ببێتـە ڕژێمێکی واقیعی و کردەوەیی بۆ ژیان.

(.................. هتد...............)

بەڵام لەمەدینــەدا ـ لەسـەرەتای کـۆچ کـردن ـ ئـەو پەیماننامـەی کـە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ جوولەکە و عەرەبەکاندا بەستی حاڵەتێك بوو ئــەم قۆناغە پێویستی دەکرد..

یەکەم: چونکە لەمەدینەدا پشووی راگەیاندن (تبليــغ) و ڕوون کردنــەوە (بیان) بۆ ئیسلام هەبوو، هیچ دەسەڵاتێکی سیاسـی ئـەوتۆ نـەبوو، ڕێگـە بگرێت و لێنەگەڕێت خەڵك بێن و موسڵمان بن، چونکە هــەموویان دانیــان بەدەوڵەتی ئیسلامی نوێ و بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نا، بـۆ جێبـەجێ کردنـی کاروبـاری سیاسـی پەیماننامەکـە لەسـەر ئـەو بنەڕەتــە داندرابوو کە کەس پەیمانی ئاشتێ نەبەستێ ، یا شــەڕێك هەڵنەگیرسـێنێ ، یا پەیوەندییەك لەگەڵ دەرەوە نەبەستێ تــەنیا بەپرسـی پێغەمبـەر (ﷺ) نەبێت! شتێکی ئاشکراشە کە دەسەڵاتدارێتی ڕاستەقینە لە مەدینە لە ژێـر

سەرکردایەتی موسڵمانەکاندا بوو و دەرگاش بۆ بانگەواز والاّ بوو، ڕێگەش بەخەڵك درا بوو بۆ هەڵگرتنی هەر بیرو باوەڕێك.

دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) لەم قۆناغەدا دەیویست تەنیا خۆی بە قورەیشەوە خەریك بکات، چونکە بەربەرەکانی کردنی قورەیش بۆ ئەم ئاینە ببووە کۆسپ لەڕووی خێڵە عەرەبەکانی تر کە چاوەڕوانی ئەوە بوون ئەم مەسەلەیەی قورەیش لەگەڵ ڕۆڵەکانیدا بەچی کۆتایی دێت!، جا پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم شت کە کردی ناردنی پەلەکان (السرایا) بوو، یەکەم ئالاّ کە بەرزی کردەوە ئەو ئالاّیە بوو کەدایە دەست (حمزە) ەی کوڕی (عبدالمطلب) لەسەری مانگی ڕەمەزان کە حەوت مانگ دوای کۆچ کردن بوو بۆ مەدینە.

پاشان ناردنی ئەم پەلانە بەردەوام بوو، لەسەرەتای هەر نۆ مانگدا جارێك نوێ دەبۆوە، پاشان لەسەرەتای هەر سێزدە مانگ نوێ دەبۆوە، پاشان لەسەرەتای هەر شازدە مانگ نوێ دەبۆوە، پاشان پەلی (عبدالله) ی کوڕی (جحش) بوو لەمانگی ڕەجەبی لەسەرەتای مانگی حەڤدەمین، کە ئەمە یەکەم غەزابوو شەڕ و کوشتاری تێدا کرا و لە مانگی حەرامدا ڕوویدا و ئەم ئایەتانەی تێدا هاتە خوارەوە:

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ! قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا﴾(البقرة: ٢١٧).

واتە: (لێت دەپرسن لەمانگی حەرام کە دەکاتە مـانگی رەجـەب ئایـا شەڕکردن تێیدا چۆن دەبێت ؟! تۆش پێیان بڵێ: شەڕکردن تێیدا گونـاهێکی گەورەیە و ڕێگرتنـــە لـە ئـاینی خـوا و باوەڕنەهێنانـە پـێ ی، مزگـەوتی حەرام[١٨] (کعبة) و دەرکردنی خەڵکەکە (واتە موسڵ ّمانەکان) ی لەلای خوا گەورەترە لەم شتانە، مانەوە لەسەر کوفر و بێ باوەڕی گەورەترە لە کوشـت و کوشتار و ئەوانە بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەن تـاکو لـە دینـی خۆتـان وەرتان گێڕنەوە ئەگەر بتوانن.

پاشان غەزای بـەدر لەڕەمـەزانی ئـەو سـاڵەدا روویـدا، کـە سـوورەتی (الأنفال) ی تێدا هاتە خوارەوە.

تێبینی کردنی هەڵوێسـتێکی تـەواو لـە کونـج و قوژبنـی روداوەکـانی واقیع، ئەو رایە پووچەڵ دەکاتەوە کە دەڵێـت (بـەرگری کـردن) بـەو مانـا تەسکەی هەیەتی بنەڕەت و ئەسڵ بووە بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی، ئەو رایەی کە چۆتە کەللەی بەزیوەکان، ئەوانەی لەبەرامبەر واقیعـی ئیمـڕۆ و لـەژێر پاڵەپەستۆی هێرشی رۆژهەلاّتناسە فێڵبازەکان بەزیون و ڕوخاون!

جائەوانەی هەوڵی دۆزینەوەی هۆی بەرگری رووت دەدەن، بۆ بزوتنەوەی هەڵکشـانی ئیسـلامی ئەوانـــە کەوتوونەتـــە داوی بزوتنـــەوەی هێرشـــی رۆژهەلاّتناسی - ئەمە لە کاتێکدایـــە کـە موسـڵمانەکان وایـان لێـهاتووە دوژمن لێیان نەترسێ و بگرە موسڵمانەکان هەر فڕیان بەســـەر ئیسـلامەوە

---

[١٨] - مانگەکانی حەرام ئەمانەن(ذو الحجة، ذوالقعدة، محرم، رجب)تفسير ابن كثير ج٢ ص ٣٦٧. مطبعة دار المعرفة ـ الثبات ـ الطبعة الثالثة ١٤٠٩هـ ١٩٨٩ م

نـەماوە!! مەگـەر تـەنیا ئەوانـەی خـوا پاراسـتونی کـە سـوورن لەسـەر ڕاگەیاندنی ئیسلام بەگشتی بۆ ڕزگار کردنی (مرۆڤ) لەسەر ڕووی (زەمین) لەهەموو دەسەلاتێك جگە لەدەسەلاتی خوا، تاکو ئاین پـەروەری هـەر بـۆ خوابێت - بۆیە بەدوای بیانوو دەگەڕێن بۆ جیهادی ئیسلامی.!

هەڵکشانی ئیسـلامی هیـچ پێویسـتی بـە پاکانـە نییـە، زیـاتر لـەو پاکانانەی کەدەقەکانی قورئان ڕوونی کردوونەتەوە:

﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الحَيَاةَ الدُّنْيَـا بِـالآخِرَةِ وَمَـنْ يُقَـاتِلْ فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَـلْ أَوْ يَغْلِـبْ فَسَـوفَ نُؤْتِيـهِ أَجْـرًا عَظِيمًـا، وَمَـا لَكُـمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِـنَ الرِّجَـالِ وَالنِّسَـاءِ وَالْوِلْـدَانِ الَّذِيـنَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هذهِ القَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُـهَا، وَاْجْعَـلْ لَنَـا مِـنْ لَدُنْـكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيْراً الَّذِيْنَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالَّذِيـنَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ، فَقَاتِلُواْ أَوْلِياءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً.﴾ (النساء:٧٤-٧٦).

واتە: (باشەڕ بکەن لە ڕێگای خوادا ئەوانەی کە ژیـانی دنیـای خۆیـان دەفرۆشـن بـەژیانی نـەبڕاوەی قیامـەت، هەرکەسـێك لـە پێنـاوی خـوادا شەڕبکا، جا بکوژرێ و شەهیدبێ یـاخود سـەرکەوێ، ئێمـە پاداشـتی زۆر مەزنی دەدەینەوە، ئێوە چیتان هەیە بۆ شەڕ ناکەن لە پێناوی خوای گـەورە و هەروەها چەوساوەکان لە پیاو و ژن منداڵ ئەوانەی کە دەڵێن: خوایە لەم شارە (مەککە) دەرمان بێنە و ڕزگارمان بکە لەدەست ئەو زۆردارانەی کـە لـە دیـن و ژیـن و ئاسـایش بێبەشـیان کردوویـن، خوایـە یارمـەتیدەر و پشـتیوانێکمان بـۆ بنـێرە. ئەوانـەی باوەڕیـان هەیـە لـە پێنـاوی خـوادا

شـەڕدەکەن و ئەوانـەی کافریشـن لـە پێنـاوی (طـاغوت) دا شـەڕدەکەن ، شەڕیکەن لەگـەڵ دۆسـتانی شـەیتان، بەڕاسـتی فڕوفێڵـی شـەیتان پـوچ و لاوازە).

﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ يَنْتَهُواْ يُغْفَرْ لَـهُمْ مَـا قَـدْ سَلَفَ، وَإِنْ يَعُـودُواْ فَقَـدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ، وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاتَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُـونَ الدِّيـنُ للهِ كُلُّـهُ فَـإِنِ انْتَهَوا فَإِنَّ اللهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ، وَإِنْ تَوَلَّوا فَـاعْلَمُواْ أَنَّ اللهَ مَوْلاكُـمْ، نِعْـمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ.﴾ (الأنفال:٣٨-٤٠) .

واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) بــەکافرەکان بڵـێ: ئەگـەر واز لـە کوفـر وخراپەکاری و دوژمـنایەتی ئیسلام بێنن خوای گەورە لێیــان خـۆش دەبـێ، ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەم کارەیــان ئـەوا ئەوسـزایەی کـە دەدرا بەمیللـەتانی پێشوو بەوانیش دەگات، جا ئێوەش شەڕیان لەگەڵ بکــەن تـاکو موسـڵمان تووشی ئازاردان و لەدین وەرگێڕان نەیەن ، فەرمان و مل کەچیش هــەر بـۆ خوابێت، جا ئەگەر وازیان هێنا ئەوا خوای گەورە هەموو شتێکیان دەبینـێ ، ئەگەر لەڕێگا لایاندا، ئەوا بزانــن خـوا یارمــەتیدەری ئێوەیــە، باشـترین پشتگیرو یارمەتیدەریش خوای گەورەیە).

﴿قَاتِلُواْ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَلا بِاليَوْمِ الآخِرِ وَلايُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ.قَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللهِ وَقَـالَتِ النَّصَارى الْمَسِـيحُ ابْـنُ اللهِ ذلِكَ قَوْلُهُمْ بِأَفْوَاهِهِمْ، يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِـنْ قَبْـلُ قَاتَلَـهُمُ اللهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ. إِتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابـاً مِـنْ دُونِ اللهِ وَالْمَسِـيحَ ابْـنَ مَرْيَـمَ وَمَـا أُمِـرُواْ إِلاّ لِيَعْبُـدُواْ إِلهـاً وَاحِـداً، لا إِلـهَ إِلاّ هُـوَ سُــبْحَانَهُ عَمَّـا

يُشْرِكُونَ. يُرِيْدُونَ أنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللهِ بِأفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللهُ إلاّ أنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْكَرِهَ الْكَافِرُونَ.﴾ (التوبة:٢٩-٣٢).

لەمەو پێش تا (صاغرون) تەفسیر کراوە... واتە: (جوولەکەکان دەڵێن (عُزیر) کوڕی خوایە و دیانەکانیش دەڵێن (مَسیح) کوڕی خوایە ئەمەش تەنیا قسەی خۆیانە ئەمەش لەقسەی کافرەکانی پێشوو دەچێت لەعنەتی خوایان لێدات چۆن لەڕێ ی ڕاست لادەدرێن، زانا (الأحبار) و ڕەبەنەکان (الرهبان) و حەزرەتی (عیسی) یان کردۆتە خوای خۆیان! ئەوانە فەرمانیان پێ درا بوو کە خوایەکی تاك و تەنیا بپەرستن، کەس خوا نییە تەنها ئەو نەبێت، دووری و پاکی بۆ ئەو لەوەی ئەوان هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن، دەیانەوێ ڕووناکی دینی خوا بکوژێننەوە بە فووی دەمیان، خوای گەورەش قبوڵ ناکات تاکو دینەکەی خۆی سەرنەکەوێ، هەرچەندە کافرەکان حەزنەکەن) ، ئەوانەن پاکانە بۆ بڕیاردانی خوایەتی خوا لەسەر ڕووی زەمین، هێنانەدی پەیڕەوەکەی لە ژیانی خەڵکدا، هەروەها بۆ دەرکردن و راونانی شەیتانەکان و پەیڕەوی شەیتانەکان ، روخاندنی دەستەڵاتداریتی ئادەمیزاد، ئەو دەسەڵاتداریتیەی خەڵك دەکاتە بەندەی خۆی لە کاتێکدا خەڵك هەموویان بەندەی خوان، بۆیە نابێت بەندەیەك فەرمانڕەواییان بکات و بەڕێوەیان ببات بەدەسەڵاتێك کە لەخۆیەوە هێنابێتی و بە شەریعەتێك کە بە هەواو ئارەزووی خۆی دایتابێ ، ئەمەندەش بەسە.. لەگەڵ بڕیاردانی بنچینەی (لا إكراه في الدين)..دان پێدانانی ئەو راستییەی کە دەسەڵاتدرێتی دەبێت هەر بۆ خوا بێت، یا ئایین پەروەری بەو پێیە بۆ خوا بێت.

ئەمانەن پاکانەو بیانووەکانی رزگارکردنی گشتی بۆ مرۆڤ لەسەر رووی زەمین، کە ئەوێش دەرهێنانی خەڵکە لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای تاك و تەنیا و بێ هاوبەش.. تەنیا ئەمەندە بەسە.. ئەم هۆیانەش هەردەم لە پێش چاوی موسڵمانە خەباتکارەکاندا بوو و هیچ کامێکیان کاتێ پرسیاریان لیٚ کرابێت ئێوە بۆ چی هاتوون؟ نەیان گوتووە: ئێمە دەرچووین بۆ بەرپەرچ دانەوەی دەست درێژی رۆم و فارسەکان لە سەر ئێمەی موسڵمانان! یاخود بۆ ئەوە دەرچووین تاکو سنووری ئەم خاکە فراوان کەین و دەستکەوت زۆر کەین!

ئەوان هەموو کاتێك وەڵامیان ئەوە بووە، هەروەك (ربعی) کوڕی (عامر) و (حذیفة) ی کوڕی (محصن) و (مغیرة) ی کوڕی (شعبة) لەشەڕی قادسیەدا، لەبەرامبەر رۆستەمی سەرکردەی سوپای فارسەکان گوتیان، کاتێ کەرۆستەم یەك لە دوای یەك لیٚ ی دەپرسین بۆماوەی سێ رۆژ پێش شەڕکردن: چی ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟ وەڵامەکەش ئەوە بوو (خوا ئێمەی ناردووە تاکو ئەوەی ویستی رزگاری بکەین لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای گەورە و تاك و تەنیا، لە ناخۆشی و تەنگی دنیا بۆ فراوانی و بەرینی دنیاوە، لەستەم و زۆری ئاینەکانی تر بۆ داد پەروەری ئیسلام.. پێغەمبەری ناردووە بۆ خەڵك تاکو بێنە سەر ئاینەکەی، جاهەریەکێك وەری بگرێ و لێمان قبوڵ بکات ئەوا ئێمە لیٚ ی قبوڵ دەکەین و لیٚ ی لادەدەین و واز لەخۆی و زەویەکەی دەهێنین، هەرکەسێکیش رازی نەبوو ئەوا شەڕی لەگەڵ دەکەین، جا یا سەردەکەوین یا ئەوەتە دەچینە بەهەشت).

بیانوویەکی خودیی هەیە لەسروشتی ئەم ئاینە خـۆی ، لـە راگەیاندنـە گشـتییەکە و لەپـەیڕەوە واقیعییەکـەی، بـۆ بەرانبـەر بوونـەوەی واقیعـی ئـادەمیزادی، بـەهۆی بارتـەقا بـۆ هـەموو لایەنـەکانی و لـە قۆنـاغی دیـاریکراودا، بـە ئـامرازی نـوێ بـووەوە.. ئـەم بیانوویـە خودییـە هـەر لەسەرەتاوە هەیە - هەرچـەندە مەترسـی دەسـت درێژکـردن بۆسـەرخاکی ئیسلامی و موسڵمانان نەبێت- چونکە بیانووەکە لەسروشت و واقیعیـەتی پەیڕەوەکەدا هەیە و لەسروشتی ئەو کۆسـپ و تەگەرانـەی کەبەڕاسـتی لـە کۆمـەڵگای ئـادەمیزادا هـەن.. نـەك بریتـی بێـت لـە هـەندێك رووداو و کارەساتی وا کەنیشانەی بەرگری کـردن لـەخۆی پێـوە دیـاربێت و کـاتیی بێـت..

ئەوندە بەسە کە موسڵمان لە ماڵەوە دەربهێنی و بیکات بـە موجـاهید لـە پێنـاوی خـوا بەنـەفس و مـاڵی و لـەپێناو ئـەو رەووشـتە بەرزانـەی کەموسڵمان هەیەتی، لەدواییدا چاوەڕوانی هیـچ دەسـکەوتێك نـەکات بـۆ خۆی و هیچ دەسکەوتێکی خۆیی لەماڵەوە دەریناهێنێ ...

لە راستیدا موسڵمان پێـش ئـەوەی جیـهاد بکـات، دەبـێ جیـهادێکی گەورەی لەگەڵ شەیتاندا لەنەفسی خۆیـدا کردبـێ، کەئەمـەش گـەورەترین جیهادە..هەروەها لەبەرامبەر هەواو ئارەزوو و چاوتێبڕینی خۆی بوەستێ ، بەرژەوەندییەکانی خۆی و بەرژەوەندییەکانی خێڵەکەی و نەتەوەکەی نەخاتە پێشەوە، دژی هەموو بەرگێك بێت لەغەیری بەرگی ئیسـلام..لەگـەڵ هیـچ هاندەرێکدا نەبێت تەنیا هاندەری خوا پەرستی و هێنانەدی دەسەڵاتی خـوا

لەرووی زەمیندا و دەرکردنـــی دەســەڵاتی ئـەو تاغوتانـەی کـە دەسـەڵاتی خوایان زەوت کردووە.

ئەوانەی بەدوای-پاکانە- بیانوودا دەگەڕێن بـۆ جیـهادی ئیســلامی بـۆ پاراستنی (نیشتمانی ئیسلامی)، چاو لە نرخ و بایــەخی (پـەیڕەو)ەکـە دە پۆشن، لە (نیشتمانی) بەکەمتر دادەنێن، ئەمەش تـێڕوانینێکی ئیسـلامی نییە بۆ ئەم نرخ و بایەخانە، بەڵکو ئەمە تێڕوانینێکی نوێیــەو بێگانەیــە و دوورە لەهەستی ئیسلامی، چونکە بیروباوەڕ و ئەو پەیڕەوەی کە بیروباوەڕی تێدا بەرچاو دەکــەوێت وئـەو کۆمەڵگایـەی کـە ئـەم پـەیڕەوەی تێـدا لـە ئارادایــە، تـەنیا ئەمانــە جێگـەی نـرخ و بایـەخ پـێ دانـن لـە هەســـتی ئیسلامیدا. بـەڵام خـاك -بەتـەنیا- هیـچ نـرخ و بایـەخێکی نییـە! لـە بۆچوونی ئیسلامیـدا ، هەر نرخێك بەخاك بدرێت ئەوەتــەنیا لەبـەر ئەوەیـە پەیڕەو و دەسەڵاتی خوای تێدا زاڵە، بــەم جـۆرە خـاك دەبێـــتە دایـەنگای بیروبـاوەڕ و کێڵگـەی پـەیڕەو و (بنکـەی ئیسـلام) و خـاڵی ڕاپـەڕین بــۆ ڕزگارکردنی (مرۆڤ).

لە ڕاستیدا پاراستنی بنکەی ئیسلام پاراستنە بۆ بیروبـاوەڕ و پـەیڕەو و ئەو کۆمەڵگایەی کە پەیڕەوی تێدایە و باڵی خۆی بەسەردا کێشاوە، بـەڵام ئەمانە ئامانجی کۆتایی نین، پاراستنی ئەمانە ئامــانجی کۆتـایی نییـە لـە بزووتنەوەی جیهادی ئیسلامیدا، بەڵکو پاراستنی بنکەی ئیسلام ڕێگایەکە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی خوایی تێیدا، تا لەدواییدا ببێتە بنکەی ڕاپـەڕین بۆ هەموو ڕووی زەمین و ڕزگار کردنـــی هـەموو جـۆری مـرۆڤ بەگشـتی. چونکە جۆری مرۆڤایەتی مەبەســت و خواسـتی ئـەم ئاینەیـە، زەمینیـش

مەودا فراوانەکەیەتی! هەروەکو باسمان کرد، راپەرین بەپەیڕەوی خوایــی زۆر بەربەستی لەشێوەی دەسەڵاتی دەوڵــەت و رژێمــی کۆمــەڵگا و بــارودۆخی شوێنەواری لەپێشدا دەوەستێت.. ئــەو بەربەرســتانەن کەئیســلام بــەتوندی رادەپەڕێت بۆ رووخاندنیان، تاکو هیچ پەردەیەك لــەنێوان خــۆی و خــەڵکدا نەهێڵێت و لەگەڵ بیرو ویژدانیان بدوێت و قسەبکات، پاش ئەوەی لە کــۆت و زنجیری ماددی رزگاریان دەکات و ســەربەخۆیی هــەڵبژاردنیان بــۆ بــەجێ دەهێڵێت. پێویستە شالاوی رۆژهەلاتناسەکان بۆ ســەر بنچینــەی (جیــهاد) لەخشتەمان نەبات و نەمان ترسێنێ، پاڵە پەستۆی واقیع لەتەرازووی هێزی جیهانی لەسەر کۆڵمان وا گران نەبێ کە وابکات بــۆ لێکدانــەوەی جیــهادی ئیســلامی بــەدوای بیــانوو و پاســاوی ئــەدەبیدا بگــەڕێین، کەلــەدەرەوەی سروشتی ئەم ئاینە بێت و لەچەند بەیەکداچوون و رووداوێکــی کــاتی زیــاتر نەبێت، کەجیهاد هەمیشە لەو رێگایەی گرتبوویە بەر نەدەوەستا، جا ئــەو هۆیانە هەبوونایە یان نا.!!

کاتێ کە ئێمە واقیعی مێژوویی پیشان دەدەین، پێویستە خۆمــان لــەو نرخ و (إعتبارات)ە خۆییانەی کە لەسروشتی ئــەم ئاینــە و لــە ڕاگەیاندنــە گشتییەکەی و لەپەیڕەوە واقیعییەکەیدا هەیــە غــافڵ نەکــەین ، تێکــەڵی نەکەین لەگەڵ پێویستییەکانی خۆپاراستنی کاتی..

لەراستیدا ئــەم ئاینــە ناچــاربوو، دەبوایــە بەرپــەرچی ئەمانــە بداتــەوە کەهێرشیان بۆ دەهێنایە سەری، چونکە بوونی ئەم ئاینە وەك راگەیاندنێکی گشتی بۆ پەروەردگارێتی خوای گەورە بۆ هەموو جیــهان و رزگــار کردنــی مرۆڤ لەبەندایەتی غەیری خوا و دروست بوونــی لەشــێوەی کۆمەڵەیــەکی

ڕێکخـراو و بزووتنـەوەیی لـەژێر سـەرکردایەتی یـەکی نـویێ ی جیـا لـــە سـەرکردایەتییە نەفامییـەکانی پێشـوو، لـەدایك بوونـی کۆمـەڵگایـــەکی سەربەخۆ و هەڵکەوتوو کـەدان بەفـەرمانڕەوایی هیـچ مرۆڤێـك نـەهێنێ، چونکە فەرمانڕەوایی تەنیا بۆخوایە..لەراستیدا تەنیا بوونی ئەم ئاینە بـەم شێوەیە، ئەو کۆمەڵگا نەفامییانەی کە هەن لەدەوروبەری و لەسەر بناغەی بەندایەتی بۆ بەندە دامەزراون، هـان دەدات هـەوڵی لـەناوبردن و هـاڕینی بـدەن، تـاکو بوونـی خۆیـان بپـارێزن، جـا لـێرەدا پێویسـتە لەسـەر ئـەم کۆمەڵگایە نوێیە بەرگری لەخۆی بکات.

ئەم بەیەکداچوونەش دەبـێ هەبێت، لەگەڵ لەدایکبوونی ئیسـلام دێتـە بوون و شەڕێکە لەسـەر ئیسـلام فـەرزکراوە و ناچـارە و دەبێـت بیکـات، بەربەرەکانێیـەکی سروشـتییە لـە نێـوان دوو قـەوارەدا، کـە نـاتوانن بۆماوەیەکی زۆر پێکەوە بژین..

ئەمانە هەمووی راستن.. بەگوێرەی ئەم تێڕوانینە ئیسلام ناچارە بەرگری لەقەوارە و بوونی خۆی بکا، ناچارە دەبێت تووشی شەڕی بەرگری کردن لـە خۆی ببێت کە بێگومان ئەم شەڕەش بەزۆری بەسەریدا سەپێنراوە...

بەڵام لێرەدا راستییەکی ترهەیە زیاتر رەسەنترە لـەم راسـتییە، ئـەویش ئەوەیە لەسروشتی بوونی(وجود) ئیسلامی دایە کەخۆی هەر لـە سـەرەتاوە بـەرەوپێش بـڕوات بـۆ رزگـار کردنـی (مـرۆڤ)ی سـەر رووی (زەمـین) لەبەندایەتی غەیری خوا ، نابێت سنووری جوگرافی رای بگرێت، یاخود لـە ناو سنووری نەژاد پەرستی گـیربخوات و واز لـە (مـرۆڤ) بێنێـت..جـۆری

مـرۆڤ.. لـه سـەر رووی (زەمـین) تـاكو دووچـاری شـەڕ و خراپـەكاری و بەندایەتی بۆ غەیری خوا بن!.

ئۆردوگاكانی دژ بە ئیسلام لەوانەیە رۆژێك دابێت وابەباش بزانن هێرش نەبەن بۆ سەر ئیسلام، ئەگـەر بێتـوو ئیسـلام وازیـان لیٚ بێنێـت بۆخۆیـان هەندێكیان بەندایەتی بـۆ هـەندێكی تـر بكـەن لـەناو سـنوور و هـەرێمی تایبەت بەخۆیان، ئیسلامیش بەمە رازی بێت و پەل هاوێژییان بۆ نەكات و بانگەوازەكە و راگەیاندنە رزگاریخوازییە گشتییەكەی خۆی نەنێرێـت بۆیان!

بەڵام ئیسلام شەڕ راگرتنیان -هدنة- لەگەڵدا ناكات، تاكو ئەوان دێـن و خۆیان بۆ دەسەڵاتداری ئیسلامی مل كەچ دەكەن لەشـێوەی (سـەرانە)دان، رێگا بۆ بڵاوكردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی دابین دەكـەن و هیـچ كۆسـپ و تەگەرەی وەك دەسەڵاتداری دەوڵەتی ناخەنە پێش.

ئەمەیە سروشتی ئەو ئاینە و ئەمەیە ئـەركی سـەر شـانی، بـەحوكمی ئەوەی كەراگەیاندنێكی گشتییە بۆ پەروەردگارێتی خوای گەورە بۆ هـەموو جیهان و رزگاكردنی مرۆڤ بە گشتی لە هەموو بەندایەتییـەك بـۆ غـەیری خوا لەناوخەڵكدا.

جیـاوازی زۆرە لـەنێوان ئـەوەی ئیسـلام لـەم شـێوەیەدا ببینـی ، یـان بەشێوەیەكی تر بیبینی كە لە ناو سنووری هەرێمایەتی و رەگەز پەرسـتیدا چەقیبیٚ و روونیشـتبیٚ، بـەجۆرێك لەترسـی دەسـت درێـژی كـردن نـەبێت بۆسەری نەجوڵێتەوە! جا ئیسلام لەم شێوەیەی دواییدا هەموو بیانووەكـانی راپەڕینی خۆی وون دەكات!

له راستیدا بیانووەکانی راپــەرینی ئیسـلامی کـاتێك بـە ئاشـکرایی و بەقوولّی دەردەکەوێت کەدێتەوە بیرمان ئەم ئاینە پەیڕەوی خوایە بۆ ژیـانی ئادەمیزادان، نەك پەیڕەوی مرۆڤ بێ، یا ڕێبازگەی تـاقمێ لەخـەلّك بـێ، یاخود رژێمی رەگەزێ لە رەگەزەکان..!!

ئێمە بەدوای بیانووی دەرەکی ناگەڕێین، تەنیا کاتێ ئەم راستییە مەزنە لە هەستماندا کزدەبێتەوە.. لەبیرمان دەچێتــەوە کەمەسـەلەکە مەسـەلەی خوایەتییە بۆ خوای گەورە و بەندایەتی بەندەیە بۆ ئـەو.. چونکـە نـاگونجێ کەسێ ئەم راستییە مەزنەی لەپێش چاو بێ و لەدواییدا بـە دوای هۆیـەکی تردا بگەڕێ بۆ جیهادی ئیسلامی!

لێرەدا دەردەکەوێت مەودایەکی زۆر نییە لە خالّی جیابوونەوە، لـەنێوان ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت ئیسلام ناچاربوو دەبوایـە تووشـی شـەڕێك ببێـت هەرچەندە خۆی ئارەزووی لێ نەدەکرد، بەحوکمی بوونی خۆیی و بوونی ئەو کۆمەلّگا نەفامییانەی تری دەوروبەری کە دەبوایە هـێرش ببەنـە سـەری و لەنێوان ئەو بۆچوونەی تر کە دەڵێت ئیسلام دەبوایە هەر لەسەرەتاوە خـۆی دەست بەجولاّنەوە بکات و بچێتە ناو ئەو شەڕە...

مەودای خالّی لێــك جیابوونـەوەش وادەردەکـەوێت زۆر نییـە، چونکـە لەهەردوو باردا ئیسلام ناچار بوو دەبوایە بچێتە ناو شەڕەکە.

بەلاّم لــەکۆتایی ڕێگـادا دوورییەکـە زۆر گـەورەتر و فراوانـتر دەبێـت، بـەجۆرێ گۆڕانێکـی زۆر گـەورە و ترسـناك بەسـەر هەسـت و ئەندێشـە و مەفاهیمی ئیسلامی دێنێت..

لێرەدا دووری و مەودایەکی زۆر گەورە و فراوان هەیــە لــەنێوان ئــەوەی وادابنێ ی ئیسلام پەیڕەوێکی خوایی یە و بــۆ بڕیــاردانی خوایــەتی خــوای گەورە لەسەر رووی زەمین و بەندایەتی هەموو ئادەمیزادێك بۆ ئــەم خوایــە تاك و تەنیایــە هــاتووە و ئــەم بڕیاردانــە لــەقالّبێکی واقیعــی دابڕێــژێ.. کەئــەویش بریتییــە لەکۆمەڵگایــەکی مرۆڤایــەتی کەخــەڵکی تێیــدا لەبەندایەتی بەندە رزگاری دەبێ، بۆ بەندایەتی خوای ئەم بەندانە، بەجۆرێك بێجگــە لەشــەریعەتی خــوا هیچــی تــر فــــەرمانڕەواییان نــەکات، ئــەو شەریعەتەش دەسەڵاتداری خوای تێدا دەردەکەوێت، یان بــەدەربڕینێکی تــر خوایەتی خوای گەورەی تێدا دەردەکەوێت.. جا هەقی خۆیەتی ئەو هــەموو بەربەستانە لەڕێ ی خۆی لابدات، تــا بتوانــێ لەگــەڵ دڵ و یژدانــی خــەڵك بدوێ بێ ئەوەی هیچ پەردە و بەربەستی دروست کرا و وەك رژێمی سیاســی دەوڵــەت، یــا بــاری کۆمەڵایــەتی خــەڵك، رێگــەی لێ بگــرێ.. لــێرەدا جیاوازییەکی زۆر گەورە هەیە لەنێوان ئەوەی کەئیسلام بەم شێوەیە دابنــێ ی و لەنێوان ئەوەی کەبە شێوەی رژێمێکی هەرێمی دیاری کراو دابنــێ ی.. کەتەنیا مافی ئەوەی هەبێت بەرگری لەخۆی بکات لــە نــاو سنوری خــۆی لەدژی ئەو هێرشانەی کە لە دەرەوەی سنورەوە دەکرێنە سەری!

ئەمە بۆچوونێکە.. ئەوی تریش بۆچوونێکی تــرە.. هەرچــەندە ئیســلام لەهەردوو باردا جیهاد دەکات ... بەڵام بۆچوونی گشتی پاڵنــەرەکانی ئــەم جیهادە و ئامانجەکانی و ئەنجامەکانی زۆر جیاوازن لــە یــەکتری ، کــە ئــەم جیاوازییەش خۆی خســتۆتە نــاو نــاخی بیروبــاوەڕ ، هــەروەها نــاو نــاخی ئاراستەو پلان دانانەوە.

ئیسلام هەر لەسەرەتاوە مافی ئەوەی هەیە دەست بەبزووتنــەوە بکــات، چونکە ئیسلام ڕێچکۆکەی میللەتێك یا ڕژێمی نیشتمانێك نییــە، بەڵــکو پەیڕەوی خوایە و ڕژێمی جیهانە ... هەقی خۆیەتی بجووڵێتەوە و دەست بە بزوتنەوە بکات بۆ ڕووخاندنی ئەو ڕژێم و بــار و دۆخانــەی کــە وەك پــەردە ڕێگە لەسەر بەخۆیی (مرۆڤ) دەگرن ، لە هەڵبژاردنی ئەو بیر و باوەڕانــەی کە خۆی دەیەوێ. ئیسلام ئەوەندەی بەسە کە هێرش ناباتە سەر کەس تاکو بە زۆری بیان هێنێتە سەر بیر و باوەڕەکەی خۆی، بەڵکو هێرش دەباتە سەر ئەو ڕژێم و بار و دۆخانە تا هەر تاکێك لە ناو کۆمەڵگادا لەو کاریگەرییــە پیس و بۆگەنانە ڕزگار بکات کە سروشت و (فطرة) ی مرۆڤ تێك دەدەن و سەر بەخۆیی هەڵبژاردنی بەند دەکەن.

ئیســلام مــافی خۆیــەتی (خــەڵك) دەربێنــێ لــە بەندایــەتی بــەندە بــۆ بەندایــەتی خـــوای گــەورە، بـــۆ هێنانـــەدی ڕاگەیاندنـــە گشـــتییەکەی پەروەردگارێتی خوای گــەورە بــۆ هــەموو جیــهان و ڕزگــار کردنــی خــەڵك بەگشتی   پەرستنی خوای گەورە بە تەنیا ـ بەپێ ی بۆچوونی ئیسلامی لە واقیعی عەمەلی ژیاندا ـ تەنیا لە ژێر سێبەری ئیسلامدا نەبێت نایێتەدی، چونکە ئیسلام تەنیا ڕژێمێکە تێیدا خــوای گــەورە شــەریعەت بــۆ هــەموو بەندەکانی دادەنێت ، بۆ سەرکردە و ژێر کــردە، بــۆ ڕەش و ســپی، دوور و نزیکیان و دەوڵەمەند و هەژاریان ،یاسایەك کە هەموویان بە بــێ جیــاوازی ملکەچ بن بۆی، ... بەڵام لە هەموو ڕژێمەکانی تری دونیــا شــوێن کــەوتوان بەندایەتی بۆ بەندەی وەك خۆیان دەکەن ... چونکــە یاســای ژیــانی خۆیــان لەبەندە وەردەگرن ، کەمافی یاسادانانیش تەنها  بۆخوایــە کــە لــە ســیفەتە

هــەرە تایبەتییەکانیــەتی، هــەر ئــادەمیزادێك داوای مــافی دەســەڵاتداری دانانی یاسای خەڵکی بۆ خــۆی دەکــرد بــیّ گومــان ئــەوە داوای خوایــەتی تایبەت کردووە بۆ خۆی، نەك بەقسە بە ڵکو بە کردەوەش، جا ئــەم داوایــە ئاشکرا بکات بەزار یان نا ئەمە گرنگ نییە، هەر ئــادەمیزادێکیش دانــی بەوەنا کە ئەم کەسە مافی یاسا دانانی هەیە بیّ گومــان ئــەوە دانــی نــاوە بەوەی کە ئەم کەسە مافی خوایەتی هەیە، جا چ بەم ناوەی ناو نا، یان نا!

ئیسلامیش بیروباوەڕێك نییــە رازی بێــت تــەنیا بــە روون کردنــەوە بــە خەڵکی رابگەیەنیّ. بەڵکو خۆی پەیڕەوێکە لە کۆمەڵــەیەکی رێکخــراوەی بزوێنەر پێك دێت کە پــەل دەهــاوێت بــۆ رزگــار کردنــی هــەموو خــەڵك، کۆمەڵگاکانی تر رێگا نادەن ئیســلام ژیــانی ئــەو خەڵکانــەی ژێردەســتیان بەپیّ ی پەیڕەوەکەی بەڕێوە ببات، بۆیە ئیسلام ناچارە ئەم رژێمانە لابدات، بەو وەسفەی کە ئەمانە بەربەستن لە رێگای رزگار کردنی گشتی ئەمــەش ـ هەر وەکو لەپێش دا گووتمان ـ مانای ئەوەیــە کــە ئــایین پــەروەری دەبێــت هەمووی بۆ خوابێت، جا لێرەدا مل کەچی و گویّ رایەڵی نــابێت بــۆ هیــچ بەندەیەك لەبەندەکان بکرێت هەروەکو ئەمە باوە لە گشــت رژێمــەکانی تــر کە لەسەر بەندایەتی بۆ بەندە دامەزراون.

ئەو لێکۆڵەرەوە (باحث) ئیسلامییە هــاو چەرخانــەی کــە لــەژێر پاڵــە پەستۆی واقیعی ئیمڕۆ و لەژێر هێرشی رۆژهەڵاتناسەکاندا بەزیون دوودڵــن لە بڕیاردانی ئەو راستییە چونکە رۆژهەڵاتناسەکان وایــان پیشــان داوە کــە ئیسلام بزوتنەوەیەك بوو بەزەبری شمشــێر دەیویســت بیروباوەڕەکــەی خــۆی بەسەر خــەڵکدا بســەپێنیّ. بــەڵام رۆژهەڵاتناســەکان چەپــەڵن و زۆر بــاش

دەزانن کە ئەمــە راســت نییــە، کــەچی بــەم شــێوەیە هۆیــە هاندەرەکــانی جیهادی ئیسلامی دەشێوێنن ... جا ئەو بەرگریکــەرە ـ بەزیوانــەی ـ کــە دەیانەوێ رووی ئیسلام بە پــاکی بێنێتــەوە، هەڵدەســتن بــۆ لابردنــی ئــەو تۆمەتە لەسەر ئیسلام، دەست دەکەن بەگەڕان بە دوای دۆزینەوەی بیانووی بەرگری کردن! هەر لەسەرەتاوە خۆیان لە سروشت و ئەرکی ئیســـلام و لــەو مافەی کە هەیەتی بۆ رزگارکردنی مرۆڤ، گێل دەکەن.

بیرو راو بۆچوونی رۆژئاوایی لەبارەی سروشتی (ئاین) ەوە بەرچاوی ئــەم لێکۆڵــەرەوە هاوچەرخــە بەزیوانــەی گرتــووە ...... کــە بــەپێ ی ئـــەم بۆچوونانە ئاین بریتییە لە (بیروباوەڕ)ێك کــە لــەناو ویــژدان دایــە و هیــچ پەیوەندی بەرژێمە واقیعییەکانی ژیان نییــە، کــە واتــە جیــهاد کــردن لــە پێناوی ئاین، مانای هەوڵدانە بۆ سەپاندنی بیروباوەڕ بەسەر (ویژدان)!

لەراستیدا ئەم کارە لە ئیسلامدا وا نییە، بەڵکو ئیسلام پەیڕەوی خوایە بۆ ژیانی ئادەمیزاد، پەیڕەوێکە لەسەر تەنیا کردنی (إفــراد) خوایــەتی بــۆ خوا ـ لە شێوەی فەرمانڕەوایەتی ـ دامەزراوە، هەروەها ژیانی واقیعی بــە هەموو وردەکارییەکانی رۆژانەیەوە رێك دەخات! کەواتە جیــهاد کــردن لــە پێنــاویدا، جیــهاد کردنــە بــۆ بڕیــار دانــی ئــەم پــەیڕەوە و دامـــەزراندنی رژێمەکــەی. بــەڵام بیروبــاوەڕ دەوەســتێتە ســەر ســەربەخۆیی بــاوەڕکردن و قەناعەت هێنان لە ژێر سێبەری رژێمێکی گشــتی و پــاش لادانــی هــەموو کاریگەرییەك.. بەم پێ یە لێرەدا کارەکە بە یەکجاری لــە بنەڕەتــەوە لێــك جیادەبێتەوە و شێوەیەکی نوێ و تەواو وەردەگرێت.

کەواتە لە هەر کویێ کۆمەڵێکی ئیسلامی پەیدا بوو ئەو کۆمەڵەی کە پەیڕەوی خوایی تێدا بەدی دەکرێت، ئەو کاتە خوای گەورە مافی جووڵانەوە و ڕاپەڕینی پێ دەدات بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتداری و بڕیاردانی ڕژێم لەگەڵ لێ گەڕانی مەسەلەی بیرو باوەڕی ناو دڵ بۆ سەر بەخۆیی ویژدانی، جائەگەر هاتوو خوای گەورە دەستی کۆمەڵەی موسڵمانی گرت لە جیهاد کردن بۆ ماوەیەك بێگومان ئەمە مەسەلەی پلانێکی کاتییە نەك مەسەلەیەکی بنچینەیی ، مەسەلەی پێویستییەکانی بزوتنەوەیە، نەك مەسەلەیەکی بیروباوەڕی بێت .. لەسەر ئەم بنەڕەتە روون و ئاشکرایە دەتوانین لە دەقە جۆرا و جۆرەکانی قورئان و هەروەها لە قۆناغە بەردەوام نویێ بووەکانیشی بگەین و نابێت تێکەڵییەك بکەین لە نێوان بەڵگە (دلالة) قۆناغییەکانی و لە نێوان بەڵگە گشتییەکەی هێڵی بزوتنەوەیی نەگۆڕاو.

# ناوەرۆك

